ئالان بادیۆ

# له ستایشی خۆشەویستیدا



دانا شوانی

کردوویەتی بە کوردی




**لە بڵاوکراوەکانی ماڵی وەفایی**
ناونیشان: هەولێر- فلکەی زراعە
فەیسبووک:
Facebook.com/mali.wafai
07504826647

**دانا شوانی**
کردوویەتی بە کوردی

# لە ستایشی خۆشەویستیدا

**ئالان بادیۆ**

**ناسنامەی کتێب**
ناوی کتێب: لە ستایشی خۆشەویستیدا
نووسەر: ئالان بادیۆ
وەرگێڕانی: دانا شوانی
ئەنجامدەری گفتوگۆ: نیکۆلاس ترۆنگ
بابەت: فەلسەفی
نرخ: (٤٠٠٠) دینار
تیراژ: ١٠٠٠
نەخشەسازی ناوەوە و دەرەوە: هێمن خدر
ساڵی چاپ: ٢٠١٥
..............
ژمارەی سپاردنی (٣٣٢)ـی ساڵی ٢٠١٥ـی پێدراوە.



ئالان بادیۆ

# لە ستایشی خۆشەویستیدا

وەرگێڕانی: دانا شوانی

**پێشکەشە بە:**

-خۆشەویستانم: «بێلانی هاوسەر و ڕۆڤان»ـی کوڕم.

**«بەو جۆرەی دەزانین، پێویستە خۆشەویستی سەرلەنوێ دابهێنرێتەوە».**

ئارسەر رامبۆ

بەشێک لە دۆزەخ، وەهمەکان ١

# ناوەڕۆک

## لە باتی پێشەکی

کتێبی «لە ستایشی خۆشەویستیدا» کتێبێکی قەبارە بچووکە، بەڵام کتێبێکی ورد و خوێنراوە و تەواو فەلسەفییە.

ئەم کتێبە یەکێکە لەو کتێبانەی فەیلەسوفی فەرەنسی ئالان بادیۆ کە بەم دواییانە نووسیویەتی و پیتەر بووش کردوویەتی بە ئینگلیزی، لە ڕاستیدا ئەم کتێبەی بادیۆ، گفتوگۆیەکی دوورودرێژی نیکۆلاس ترۆنگە لەگەڵی، تەواوی گفتوگۆکە، لە چوارچێوەیەکی فەلسەفییدا دەخولێتەوە، زۆر بە وردی فەلسەفەی خۆشەویستی شی دەکاتەوە.

خۆشەویستی تەنها لە یەك پانتایی گەمارۆ نادرێ، هەر کات لە یەك پانتایی و لەیەك سەرزەمین گەمارۆ درا، ئیتر واتە کوشتت، واتە ڕۆحت لەبەر بڕی، بچووکت کردەوە.
ئالان بادیۆ لە بنەڕەتدا مەڕاکیشییە؛ لە سەرەتای مانگی

یەکی ساڵی ١٩٣٧ لە ڕیبات، پایتەختی مەراکیش، چاوی بە دنیا هەڵهێناوە و پاشان وەك فەیلەسوفێکی فەرەنسی ناو و ناوبانگی پەیدا کردووە. هاوشان بە گیۆرگیۆ ئاگامبێن و سلاڤۆی ژیژەك بە یەکێ لە نەیاران و دژە پۆست مۆێرنیست ناسراوە، بادیۆ هەوڵەکانی لە پێناساندنەوەی چەمکەکانی بوون و هەقیقەت و ڕووداو و سوبێکتە بەڵام نەك بەو چەشنەی پۆست مۆدێرنەکان بانگەشەی بۆ دەکەن.

ئالان بادیۆ لە ساڵانی ١٩٥٦ تا ١٩٦١ لە زانکۆی ئیکۆڵ نۆرماڵ سوپەریۆر فەلسەفەی خوێندووە و پاشان ڕوویکردۆتە زانکۆی سۆربۆن. هەر لەوێ سیاسەت و ماتماتیکیشی خوێندنەوە. بە یەکێك لە دامەزرێنەرانی پارتی یەکگرتووی سۆشیالیست دادەنرێت. ئەم پارتە لەهەوڵی بەرەنگاربووونەوەی کۆڵۆنیاڵیزمدا بوو لە جەزائیر. بادیۆ یەکەم ڕۆمانی ساڵی ١٩٦٧ نووسیوە و پاشان بووە ئەندامی گرووپێکی توێژینەوەکە ئاڵتوسێر بونیادی نابوو، دوا ئەوەش بە چڕی کەوتە ژێر کاریگەری ژاك لاکانەوە.

•

بادیۆ لە کتێبی لە ستایشی خۆشەویسیتیدا هاوشان بە پێشەکی و پاشەکییەك، لە دەوری شەش تەوەردا

هەوڵیداوە کۆی دید و بۆچوونەکانی خۆی لە بارەی خۆشەویستی بخاتە ڕوو:
تەوەری یەکەمی کتێبەکە بەناوی خۆشەویستی لە بەردەم هەڕەشەدا؛ لەو بەشەدا بادیۆ بە گەڕانەوە بۆ چەند سەرچاوەیەکی هەڕەشەی خۆشەویستی بۆچوونی خۆی دەخاتە ڕوو، بەتایبەت دیدی خۆی لەبارەی سایتەکانی دۆزینەوەی هاوسەر بە ڕاشکاوی دەخاتە ڕوو. لە ڕاستییدا ئەتوانین بڵێین، هەر کات خۆشەویستی هەبێت، هەڕەشەش هەیە، بەڵام هەڕەشەکانی بەردەم خۆشەویستی لە کولتوورێکەوە بۆ کولتوورێکی تر، لە پانتاییەکەوە بۆ پانتاییەکی تر جیاوازە، ئەو هەڕەشەیەی لە ئەورووپا ڕووبەڕووی دەبێتەوە، جیاوازە لەو هەڕەشەیەی لە کوردستان ڕووبەڕووی دەبێتەوە.
گرنگترین و بەرچاوترین هەڕەشەیش، بادیۆ گوتەنی، سایتەکانی دۆزینەوەی هاوسەر و هاوسەرگیرییە؛ بادیۆ پێی وایە هەرکات خۆشەویستی لە چوارچێوەی سایتێکی ئەنتەرنێتی و وێنەیەك بچووك بێتەوە، ئەوا بە مانای گەمارۆدانیەتی، گامارۆدانی خۆشەویستی بە مانای کوشتنی، بەمانای مردنیەتی.
هەڕەشەیەکی تری بەردەم خۆشەویستی، حاشاکردنە

لێی، دەستەبەرنەکردنی چوارچێوەیەکی ئەمنی و ئاسایشە بۆی، هەرکات خۆشەویستی پڕ مەترسی بوو، هەڕەشەکانی بەردەمیشی زۆرتر دەبێت، هەربۆیە زۆرترین قوربانی لەم مەملەکەتە، قوربانییەکانی خۆشەویستییە. تەوەری دووەمی کتێبەکە بەناوی فەیلەسووفان و خۆشەویستییە. بادیۆ گوتەنی پەیوەندی نێوان فەیلەسوف و خۆشەویستی بە دڵنیاییەوە هیچ سەرڕاست و بێپەردە نییە. کەم فەیلەسوف ئەدۆزیتەوە مێژوویەکی بێکۆتاییی لەگەڵ خۆشەویستیدا نەبێت. هەر بۆیە بە دیدی بادیۆ، دوو ڕەوتی دژ و جیاواز لەنێوان فەیلەسووفەکان پەیدا دەبێت، ڕەوتی یەکەمیان ئەو ڕەوتەیە کە بە ‹دژەخۆشەویستی› ناوسراوە و ئارسەر شۆپنهاوەر نوێنەری سەرەکی ئەو ڕەوتەیە.

ڕەوتی دووەمیان، ئەو ڕەوتەیە کە پەیوەندییەکی نزیکی بە خۆشەویستیەوە هەیە و ڕەوایەتی پێی دەدات؛ سورێن کییرکەگارد، نوێنەری سەرەکییەتی و خۆشەویستی بە یەکێ لە بەرزترین شێوەکانی ئەزموونی خودی دەگۆڕن. بادیۆ لەم بەشەدا بە گەڕانەوە بۆ دیدی فەیلەسوفانی وەك ئەفلاتوون، ژاك لاکان، لڤیناس و کییرکەگارد، دید و دادوەری خۆی لەبارەی خۆشەویستی دەخاتەڕوو.

تەوەری سێیەمی گفتوگۆکان باسکردنە لە بینای

خۆشەویستی، لەو بەشەدا بادیۆ باسی بۆچوونێکی ڕامبۆ دەکات، ئەو یەك لەو فەیلەسووفانە بوو کە دەیووت پێویستە خۆشەویستی هەمدیس نوێ بکەینەوە و ڕوحێکی تری بە بەردا بکەین، و ئالان بادیۆش پێی وایە کە پێویستە خۆشەویستی لە دوو گۆشە و دیدەوە لێی بڕوانین: یەکەم، خۆشەویستی جیاوازیی یان دابڕانێکی پشتئەستوور بە جیاوازیی نێوان دوو مرۆڤ و سوبێکتە سەرجەمیەتییەکانیان لە خۆ بگرێ، ئەم دابڕانە، لە زۆربەی بوارەکاندا، جیاوازیی سێکسواڵییە. دیدی دووەم پێی وایە خۆشەویستی بەردەوام تووشی ڕووبەڕووبونەوە دەبێتەوە، هیچ کاتێ ناتوانرێ خۆشەویستیەك بدۆزرێتەوە، تووشی ڕوبەڕووبونەوە نەبووبێتەوە، هەرکات خۆشەویستیی بێ ڕووبەڕووبونەوە هەبوو، ئەوا دەبێت گومان لە هەقیقەتی ئەو خۆشەویستیە بکرێ. خۆشەویستی لە دیدار و یەکتربینینی یەکەمدا ڕوودەدات، دەستپێکی هەر خۆشەویستییەك بۆ دیداری یەکەم دەگەڕێتەوە.

لە تەوەری چوارەمدا کە بەناوی هەقیقەتی خۆشەویستییە، چەند پرسیارێك دەخرێتە ڕوو بەتایبەت ئەو پرسیارەی کە ئاخۆ شتێك هەیە بە ناوی هەقیقەت، تا خۆشەویستی بە خۆیەوە بگرێ، ڕەوایەتی بە خۆشەویستی بدات؟ ئەفلاتوون

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا پێی وایە پەیوەندییەکی تایبەت لەنێوان خۆشەویستی و هەقیقەتدا هەیە، و بادیۆش پێی وایە خۆشەویستی ڕەهەندێکی هەقیقەتە. تەنانەت هەر بەمەش ڕاناوەستێ و پێی وایە خۆشەویستی لە هەقیقەتدا هەر ئەو شتەیە کە من لە فەرهەنگی فەلسەفیی خۆم بە ڕەهەندێکی هەقیقەت لە قەڵەمی دەدەم، واتە ئەزموونێ کە دەبێتە هۆی ئەوەی جۆرێکی تایبەت لە هەقیقەت دروست ببێت. تەوەری پێنچەمی کتێبەکەش بریتییە لە دوان لەبارەی خۆشەویستی و سیاسەت، ئاخۆ پەیوەندی لەنێوان خۆشەویستی و سیاسەتدا هەیە، ئاخۆ خۆشەویستیی ناو سیاسەت هەر ئەو خۆشەویستیەیە کە لە دەرەوەی پانتایی سیاسییدا هەیە؟ ئاخۆ سیاسەت، خۆشەویستی ئەتك ناکات؟

بە دیدی بادیۆ، سیاسەت ڕەهەندێکی هەقیقەت دەخولقێنێ، بەڵام ڕەهەندێك کە پشت بە پانتایی هەمووان، بە کۆمەڵ دەبەستێت. بادیۆ پێی وایە دەکرێ خێزان وەك دەوڵەتی خۆشەویستی پێناسە بکرێ، بۆ نموونە کاتێ لە بزووتنەوەیەکی سیاسیی جەماوەرییدا بەشداری دەکەیت، بۆ خۆت هەر ئەو گرژییە مانادارە ئەزموون دەکەیت کە لەنێوان پرسیاری (پانتایی گشتی بە چ مانایەکە)

و دەسەڵات و هێزی دەوڵەتدا بوونی هەیە. بەم پێیە، دەوڵەت تا ڕادەیەك هەمیشە لەباری خیانەتە بەرامبەر ئومێدی سیاسی.
ئاخۆ پێویستە هەنووکە باسی ئەوە بکەین کە خێزان هەمیشە لەباری خیانەتە بەرامبەر بە خۆشەویستی؟ ئەوە ڕوونە کە پێویستە ئەم پرسیارە بخرێتە ڕوو، بەو چەشنەی کە بادیۆ پێی وایە، ئەمە خاڵ بە خاڵ کاریگەری خۆی بە جێ دەهێڵێ، و بڕیار یە بڕیاریش. هەرکاتیش کردە و ڕەفتاری سیاسیی هاتە نێو دنیای خۆشەویستی و ئەڤیندارییەوە ئەوە بێگومان ئەتککردنی خۆشەویستی دەبێتە پێشبینیکراو. لە کەم شوێن و سیاسەتی جیهانییدا سیاسەتێك ئەدۆزیتەوە کە خاڵی بێت لە تێکشاندن و ڕووخانی یەکتری، سیاسەت واتە بەرژەوەندی یەکلایەنە کە ئەگەرەکانی کەوتن و پاشەقولادانی ئەویتر شایەنی بینینە.

بادیۆ هەر لەو بەشەدا پێیوایە کە خاڵی داهێنانی منداڵان، کار، هاوڕێ، خڕبوونەوەی شەوانە، پشووەکان، و هەر خاڵێکی تر، بە مانای مۆنۆپۆلکردن و گەمارۆدانی هەموو ئەم خاڵانەیە بە ڕاگەیاندنی خۆشەویستی هیچ بابەتێکی سەرڕاست و بێپەردە نییە.

لە کۆتا تەوەردا کە تەوەری خۆشەویستی و هونەرە، بادیۆ باس لەو پەیوەندییەی نێوان هونەر و خۆشەویستی و باسی پێگەی سووریالیستەکان لەم پەیوەندییەدا دەکات. بە دیدی بادیۆ، پرۆژە سەرەکییەکەی سووریالیستەکان پەیڕەویکردنە لەو دەستوورەی ڕامبۆی شاعیر کە بڕوای بە دووبارەداهێنانەوەی خۆشەویستییە، و بۆ سوورریالیستەکانیش ئەم داهێنانەوەیە بە شێوەیەکی شلۆق و جووڵەیەکی هونەری، ئۆنتۆلۆجی، و سیاسی بوو. بە دیوێکی تریشدا، هونەر زۆرجار ڕووە کۆمەڵایەتییەکەی خۆشەویستیی پیشان داوە، بەو چەشنەی کە تەواوی خەڵکی ڕەشۆك پێیان وایە، بەڵام بەهەر حاڵ، ئاشقان لە جیهاندا کەسانی تەنهان. تەنها ئەوان هەڵگری ئەو جیاوازیانەن کە لەو جیهانەدا ئەزموونی دەکەن.

ئەوەی ماوەتەوە بیژم: ئەگەر ئەتەوێ باشتر و بە دیدێکی فەلسەفیی و ڕوون لە خۆشەویستی تێبگەیت، خوێندنەوەی ئەم کتێبەی بادیۆ، یارمەتییەکی باشت بۆ دەستەبەر دەکات. ئەم کتێبە کۆمەکەرێکی باشە بۆ ئەو کەس و خوینەرانەی ئەیانەوێ لە دیدێکی فەلسەفیی لە خۆشەویستی بڕوان.

ئەم کتێبە لەم سەرچاوانەی خوارەوە وەرگێڕدراوە و هەر

لەرستە و دێرێکدا گەڕانەوە و تێکهەڵکیشاندنی دەقەکان کردەنی بووە:

یەکەم: الن بدیو، در ستایش عشق، ترجمە مریم عبدالکریم کاشی، نشر ققنوس، ۱۳۹۳.

دووەم: الن بدیو، در ستایش عشق، ترجمە مجتبا گل محمدی، نشر انترنیتی، بدون سال چاپ و اسم نشر.

سێیەم: الان بادیو، فی مدح الحب، ترجمە، غادە الحلوانی، التنویر،۲۰۱٤.

چوارەم: **Alain Badiou, In Praise of Love, Serpents ,۲۰۱۲ ,translated bt Peter Bush .Tail**

فەیلەسوف هیچ کات نابێ پێگە بێ هەژمارەکانی ژیان کە تیایاندا هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ئەوانیتر نییە، فەرامۆش بکات. بێجگە لەمەش، نەریتی شانۆیی و، بە شێوەیەکی تایبەت، شانۆی کۆمیدی بەشێوەیەکی هەژێنەر ئەم ڕاستییە باس دەکات. لەمە بەدوا، کەسایەتییەکی شانۆیی ئاسایی و فەیلەسوفێکی ئاشق هەن کە حیکمەتی ڕەواقی و بێ متمانەییە ڕانەهێنراوەییەکەی بەرامبەر بە سۆزی خۆشەویستانە ڕێك لە ساتەوەختێك کە ژنێك بە جوانییەکی بریقەدارانە لە نێو ژوورەکە خونچە دەکات یان بەتەواوی ڕەشت دەبێتەوە و ئەو بۆ هەمیشە گیر دەخوات.

ماوەیەك لەمەوپێش لەمە تێگەیشتم. پێموایە فەیلەسوف (ئەمە ناوێکی بێلایەنە بەدڵنیاییەوە جۆرەکانی پیاو و ژن دەگرێتەوە) دەبێ بیرمەندێکی کارامە، شاعیرێکی نەشارەزا و چالاکوانێکی سیاسی بێت، بەڵام دەبێ ئەمەش تێبگەین کە پانتایی بیرکردنەوە هەرگیز لە هێرشە بێ بەزەیی و

زەبروزەنگاوییەکانی خۆشەویستی بێ زیان نابێت. فەلسەفە داوا لە خوازیارانی بواری فەلسەفە دەکات، جا چ ژن بن یان پیاو، لە ڕۆڵەکانی بیرمەند، هونەرمەند، ئەکتەر و ئاشقدا دەربکەون. من ئەمانە بە چوار مەرجەکەی فەلسەفەی دەزانم.

بەم هۆیە ئەو کاتەی کە نیکۆلاس ترۆنگ بانگیشتی کردم لە گفتوگۆیەك لە کۆمەڵەی «شانۆی ئایدیاکان» کە لە ڤیستیڤاڵی ئاڤینیۆن ڕێکخرابوو بەشداری بکەم، بێ دوودڵی قبوڵمکرد. وا بەرچاو دەکەوێ ئەم گفتوگۆییانە خواردنێکی ویستراو و خۆشی شانۆ، گفتوگۆ، خەڵك، خۆشەویستی و فەلسەفەیە. وێڕای ئەوەش، گفتوگۆکە وابڕیاربوو چواردەی تەمموزی ٢٠٠٨ بەڕێوە بچێت و ئایدیای ڕێزلێنانی خۆشەویستی تووشی سەرسورمانمیکردبوو؛ هێزێکی هەمەگیر، وێرانکەر و سێکسی کە سنوور و کاروباری کۆمەڵایەتی خستبووە ژێر پێ، ئەوەش لە ڕۆژگارێ کە بەشێوەیەکی سروشتی بە سوپا، میللەت و دەوڵەتەوە پەیوەستە.

هەنوکە با کەمێ فوو بە زورنادا بکەین: نیکۆڵاس پرسیارەکانی خستە ڕوو، منیش ڕۆڵی ئاڵۆز و دوولایەنەی فەیلەسوفی خۆشەویستیم پێ سپێردرابوو. پێکەوە بە

باشی کارمان کرد ئەمەش بە جۆرێ لە سەرکەوتن لە قەڵەم ئەدرێت. هیچ گومانێك لە ئارادا نییە: بە ئامانج گەیشتین.

ئەو دەقەی لەبەردەمتە ڕوونکردنەوەی قسەکانی ئەو ڕۆژانەیە. دەقەکە ڕیتمی خۆبزواوی و ڕوونی پاراستووە، بەڵام بێ کەموکوڕی و ڕاشکاوونەترە. پێموایە دەقەکە لە سەرەتاوە تا کۆتایی ئەو شتەیە کە بانگەشە دەکات: ستایشی خۆشەویستی، سروودی فەیلەسوفێکی وەك ئەفلاتوونە یان ئەگەر کەسێك وەك ئەو بیر بکاتەوە: «ئەو کەسەی لە خۆشەویستییەوە دەست پێ نەکات، هیچ کات پەی بە چییەتی فەلسەفە نابات». لەبەرئەوە لێرەوە ئالان بادیۆ، فەیلەسوفی خۆشەویستی، لەگەڵ نیکۆلاس ترۆنگ، فەیلەسوف و دواندنەرێکی حەکیم و هەڵبەتە ئاشق، دەست و پەنجە نەرم دەکات.

**پرسیار: لە کتێبی «*مانای سارکۆزیی*»ـدا کە دوای بڵاوبوونەوەی، زۆر بە خێرایی پێشوازییەکی باشی لێکرا، پێتوایە «پێویستە ئێمە خۆشەویستی دابهێنینەوە، بەڵام لەهەمان کاتدا، بنجبڕانە بەرگری لێ بکەین، لەبەرئەوەی خۆشەویستی لە هەموو لایەکەوە ڕووبەڕووی مەترسی بۆتەوە». خۆشەویستی بە چ شێوەیەك ڕووبەڕووی هەڕەشە دەبێتەوە؟ بەدیدی ئێوە، چۆن هاوسەرگیرییە ڕێکخراوەکانی ساڵانی پێشوتر لە پۆشاکە تازەکانی ئەمڕۆدا ڕێکخراون؟ پێموایە پڕوپاگەندەکانی ئەم دواییەی ویبسایتێکی دۆزینەوەی هاوسەر یان دانانی وادەی سۆزدارانە سەرەنجی ئێوەی بەتایبەت بەرەو لای خۆی ڕاکێشاوە...**

**ئالان بادیۆ:** هەر بەو چەشنەیە. دیوارەکانی پاریس سیخناخ بووە لە پۆستەرەکانی سایتی هاوسەرگیری ئینتەرنێتی «میتیك» (**Meetic**)، کە بە دیدی من، پڕوپاگەندەکانی

بەڕاستی ئازاردەرن. دەتوانم ئاماژە بە هەندێ لە دروشمەکانی بکەم کە لێوانلێون لە ئاژاوەچێتی. سەرەتا بەشێوەیەکی نارەوا سوود لەناونیشانی شانۆنامەکەی مارفیۆ، واتە ***گەمەی خۆشەویستی و شانس***[1]، وەردەگرن و دەڵێن: «لە دەرەوەی شانسەوە ئاشق ببە!» و پاشان لە شوێنێکی تردا دەڵێن: «بێ شکستخواردن لە خۆشەویستییدا، ئاشق ببە!» هیچ دابڕانێك بوونی نییە، ئاخۆ ئەوە ڕاستە؟ دووبارە لەشوێنێکی تردا دەڵێن: «خۆشەویستی پێرفێکت، بێ ئازار و خۆماندووکردن بەدەستبهێنە!» هەموومان سوپاسگوزاری سایتی هاوسەرگیریی میتیکین... ئەم پێشنیازانە بە چەقە چەقەوە دەخەنە ڕوو (هەناسەشمان لێ دەبڕێت) لەمەڕ «ڕاهێنان لە خۆشەویستییدا». بەم پێیە، ڕاهێنەرێکت لەبەردەم دادەنێت کە بۆ ڕووبەڕووبونەوە بە ئەزموونێکی گەورە ئامادەت دەکات.

من لەو بڕوایەدام ئەم ئاژەوەگێرییە، ڕەنگدانەوەی چەمکێکی پاراستن ئاسایە لە «خۆشەویستی». ئەم خۆشەویستییە بەگشتی لە بەرامبەر هەموو ڕیسکەکاندا بیمەکراوە، تۆ ئاشق دەبیت، بەڵام بەرژەوەندی و پاشەڕۆژی پەیوەندی داهاتووت زۆر بە گشتگیری هەڵدەسەنگێنرێ،

[1]. The Game of Love and Chance, Marivaux

دەتوانیت هاوژین و یاوەرەکەتان بە شێوەیەکی ورد لە ڕێگەی ئۆنلەینەوە هەڵبژێریت (بێگومان بە دەستکەوتنی وێنەیەك، شتە لاوەکییەکانی حەزی ئەو، بەرواری لە دایکبوونی، نیشانە دیارەکان، و شتانێکی لەم چەشنە) و بە ئاوێزانکردنی هەموو ئەم شتانە دەتوانیت بە خۆتان بڵێیت: «ئەمە هەڵبژاردنێکی بێ مەترسییە!» ئەم ڕستەیە خاڵی لوتکەکەیانە و ئەمەش فریودەرە، لەبەرئەوە پێویستە ململانێی پروپاگەندەئاسا بەکار بهێنرێت. بە ئاشکرا، بەو چەشنەی کە خۆشەویستی هەر ئەو لەززەتەیە کە تارادەیەك هەموو کەسێ بەدواوەیەتی، واتە ئەو شتەی کە گورڕوتین و مانا بە ژیانی تارادەیەك هەموو کەسێ دەدات، من تووشی سەرسوڕمانی و دۆشدامان لەبەردەم قسە بومەتەوە کە خۆشەویستی ناتوانێ وەك دیارییەکی پێشکەشکراو بەگوێرەی لەدەستدانێکی تەواوی ڕیسکدا بێت. ڕەوتی میتییك، پروپاگەندەکانی سووپای ئەمریکام لە سەردەمی پەرەپێدانی ئایدیای بۆمبە «هۆشمەندەکان» و جەنگە «بێ مردووەکان» بیر دەهێنێتەوە.

**پ: کەواتە پێتوایە پەیوەندییەك لە نێوان جەنگە «بێ مردووەکان» و خۆشەویستییە «بێ ڕیسکەکان»ـدا**

**هەیە. بە هەمان ئەو ڕێگایەی کە کۆمەڵناسەکانی وەك، ڕیچارد سێنت و زیگمۆنت باومەن،[٢] هاوشێوەییەك دەبینن لە نێوان «بێهەستبوون بەرامبەر ئەو بەڵێنەی» کە سەرمایەدارێکی بازرگان بە کرێکارێکی کرێگردەی دەدات و «هیچ بەڵێنێ لەلایەن منەوە بوونی نییە»ـی ئەو تاکە «ئاشق پیشەیەی» ئەم لە کاتێکدا بە یار و هاوژینەکەی دەڵێت کە ئەوان لە جیهانێکی پڕ ژاوەژاو دان و پەیوەندییەکەیان بەناوی ئاسانکاری و دنیایەکی ئارام و مەسرەفگەراوە تێك و پێك دەدرێن؟**

**ئالان بادیۆ:** هەموو ئەمانە کەم تا زۆر هەمان سیناریۆیە. جەنگە «بێ مردووەکان»، و خۆشەویستیی «بێ ڕیسك»، نە هیچ شتێکی هەڕەمەکی و ڕێکەوت، نە هیچ ڕووبەڕووبونەوەیەکی شانسیی لە ئارادا نییە. ویڕای ئەوەش، ئەم دروشمە پشتیوانی لە هەموو سەرچاوەکانی چالاکییەکی پروپاگەندەیی بەربڵاو دەکەن، بە دیدی من، ئەوە یەکەمین هەڕەشەیە لەبەردەم خۆشەویستی، ئەو شتەی کە بە هەڕەشەی «سەلامەتی» لەقەڵەمی دەدەم. بە هەر حاڵ، ئەمەش جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ هاوسەرگیرییەکی ڕێکخراودا نییە. ئەم هاوسەرگیرییەی

٢. Richard Sennett and Zygmunt Bauman

کە نەك بە ناوی ڕێکخستن و هیرارکییەتی خێزانیی بە دەست دایك و باوکانی ستەمکارەوەیە، بەڵکو بەناوی بەدیهێنانی سەلامەتی بۆ تاکە دەرگیرەکان، بەگوێرەی چەند ڕێکەوتنێکی ئەنجامدراو دروست دەبێت. هەموو ئەو ڕێکەوتانەی کە لە هەڕەمەکیبوونەوە، ڕووبەرووبونەوەی شانس و لە دواجاردا هەر چەشنە شیعرێکی ئیگزیستانسیالی دەبنە بەربەست، ئەوەش بە هۆی نائامادەیی گاتیگۆریی ڕەهایی ڕیسکەکانەوەیە.

دووەمین هەڕەشە کە خۆشەویستی ڕووبەڕووی دەبێتەوە حاشاکردنە لەوەی کە ئەم هەڕەشەیە لە بنەڕەتدا بایەخی نییە. خاڵی بەرامبەر هەڕەشەی سەلامەتی ئەم ئایدیایە کە خۆشەویستی تەنیا چەشنێکی ترە لە هیدۆنیزمی[٣] بەرچاو، و تەنیا لە پانتایی بەربڵاوی چێژدا گونجاوە. ئامانجی دوورکەوتنەوە لە هەر چەشنە قەیرانێکی بێ ناوبڕ، و هەر چەشنە ئەزمونێکی قووڵ و ڕاستەقینەی ئەویتربوونە کە خۆشەویستی لێیەوە دەتەنرێت. سەرباری ئەمەش، پێویستە ئێمە ئەوەشی بۆ زیاد بکەین کە فاکتەری مەترسی هەرگیز ناتوانێ بەتەواوی ڕیشکەکێش بکرێ. پروپاگەندەکانی میتییك،

---

٣. hedonism

وەك پروپاگەندە بۆ سوپا ئیمپراتۆرسەنتەرەکان، دەبێژێت مەترسییەکان دەبێتە ماڵی هەر کەسێکی تر، جگە لە تۆ! ئەگەر زۆرباش بۆ خۆشەویستی پەروەردە کرابیت، و پەیڕەوی لە یاساکانی سەلامەتی مۆدێرنت کردبێت، کۆتایهێنان و پچڕانی پەیوەندیت لەگەڵ ئەو کەسەی کە بۆت گونجاو نییە، کارێکی دژوار نابێت. ئەگەریش ئەو ئازاریش بکێشی، ئیدی پەیوەندی بە خۆیەوە هەیە، مەگەر وا نییە؟ ئەو بەشێك نییە لە مۆدێرنیتە. بە هەمان ئەو ڕێگەیەی کە جەنگە «بێ مردووەکان» تەنیا لەمەڕ تەوژمی سەربازی خۆرئاوایی بەکاردەهێنرێ. ئەو بۆمبانەی کە ئەوان دەیهاوێژن، زۆرێك لەو مرۆڤانە دەکوژن کە تەنیا کەموکوڕییان ژیانیانە لە ئاستیی خوارەوەدا، بەڵام ئەم مردووانە، ئەفغانییەکان، فەلسەتینییەکان و خەڵکانی لەم چەشنەن... ئەوان هیچ جۆرە پەیوەندییەکیان بە مۆدێرنیەتەوە[٤] نییە. خۆشەویستیی لێوانلێو لە سەلامەتی، هەر شتێکی ڕێبەرایەتیکراو لەلایەن نۆرمە سەلامەتییەکانەوە، دەرخەری نائامادەیی ڕیسکەکانە بۆ ئەو مرۆڤانەی کە پاشخانێکی باشییان هەیە، سوپایەکی باش، هێزێکی پۆلیسی باش، تێگەیشتنێکی سایکۆلۆژی

٤. modernity

باش لە هیدنیزمی کەسیی، و هەموو ڕیسکەکان بۆ ئەو کەسانەیە کە لە لایەنی بەرامبەرن.

پێویستە ئاگاداری ئەوە بیت کە چۆن بەردەوام پێمان دەڵێن: هەموو کاروبارەکانت «لە خزمەت ئاسایش و سەلامەتیتاندا بێت»، لە تەگەرەکانی پیادەڕۆییە سینگفرۆشەکانەوە بیگرە تا پاسەوانەکانی پۆلیس لە میترۆ. خۆشەویستی ڕووبەڕووی دوو دوژمن دەبێتەوە، لە بنەڕەتدا: پاراستنی دەستەبەرکراو بە بیمەیەکی پۆلیسی و ناوچەی ئاسودەیی سنوردارکراو بە چێژە ڕێسادارەکانەوە.

**پ: کەواتە چەشنێ پەیمان لەنێوان ئایدیاکانی لەیبرتارین[٥] و لیبراڵ لەبارەی خۆشەویستییدا هەیە؟**

**ئالان بادیۆ:** لە پراکتیکدا من پێموایە لیبراڵەکان (ئازادیخوازەکان) و لەیبرتارینەکان (ئازادبیرەکان) لە دەوری ئەم ئایدیادا دەخولێنەوە کە خۆشەویستی ڕیسکێکی بێ کەڵك و پوچە. ئەمەش لەلایەك، دەتوانیت جۆرێ هاوسەرگیری بەرنامەرێژکراو بە تەواوی شادی و خۆشییە کەماڵەکان بەدەست بهێنیت، و لە لایەکی تر، لە بەرنامە سێکسییە سەرگەرمکەرەکانی لێوانلێو لە چێژ

٥. Libertarian

باش لە هیدنیزمی کەسیی، و هەموو ڕیسکەکان بۆ ئەو کەسانەیە کە لە لایەنی بەرامبەرن.
پێویستە ئاگاداری ئەوە بیت کە چۆن بەردەوام پێمان دەڵێن: هەموو کاروبارەکانت «لە خزمەت ئاسایش و سەلامەتیتاندا بێت»، لە تەگەرەکانی پیادەڕۆییە سینگفرۆشەکانەوە بیگرە تا پاسەوانەکانی پۆلیس لە میترۆ. خۆشەویستی ڕووبەرووی دوو دوژمن دەبێتەوە، لە بنەڕەتدا: پاراستنی دەستەبەرکراو بە بیمەیەکی پۆلیسی و ناوچەی ئاسودەیی سنوردارکراو بە چێژە ڕێسادارەکانەوە.

**پ: کەواتە چەشنێ پەیمان لەنێوان ئایدیاکانی لەیبرتارین[٥] و لیبراڵ لەبارەی خۆشەویستییدا هەیە؟**

**ئالان بادیۆ:** لە پراکتیکدا من پێموایە لیبراڵەکان (ئازادیخوازەکان) و لەیبرتارینەکان (ئازادبیرەکان) لە دەوری ئەم ئایدیادا دەخولێنەوە کە خۆشەویستی ڕیسکێکی بێ کەڵك و پوچە. ئەمەش لەلایەك، دەتوانیت جۆرێ هاوسەرگیری بەرنامەڕێژکراو بە تەواوی شادی و خۆشییە کەماڵەکان بەدەست بهێنیت، و لە لایەکی تر، لە بەرنامە سێکسییە سەرگەرمکەرەکانی لێوانلێو لە چێژ

٥. Libertarian

سوودمەند بیت، لەکاتێکدا هەستە توند و ئاگرینەکان لەبەرچاو نەگریت. لەم گۆشەنیگایەوە، بەڕاستی پێموایە کە خۆشەویستی، لە جیهانی ئەمرۆ، لەم کۆت و بەند و، لەم دۆخە پوچەڵەدا گیرۆدە دەبێت و لە ئاکامدا، تووشی هەڕەشە دەبێتەوە. من پێموایە ئەمە پەیامی فەلسەفەیە، هەروەها کایەکانی تریش، کە بۆ بەرگریکردن لێی پۆلینبەندی دەکەم، و ئەم ئەگەرەش، بەو چەشنەی ڕامبۆی شاعیر دەیڵێت، بەمانای ئەوەیە کە خۆشەویستی پێویستی بە داهێنانەوەیە. ئەمە ناتوانێ کردەیەکی بەرگریی بێت بۆ پاراستنی ڕەوشی باو. جیهان پڕە لە وەرچەرخانە تازەکان و پێویستە خۆشەویستی شتێ بێت دابهێنرێ. پێویستە ڕیسککردن و ئاژاوەگێری لەبەرامبەر سەلامەتی و ئاسایش دابهێنرێن.

**پ: دەستەواژەی «خۆشەویستی پێویستی بە سەرلەنوێ داهێنانەوەیە» لە ڕامبۆوە وەرتگرتووە، هەروەها بۆ بیناکردنی تێگەیشتنی خۆت بەرامبەر خۆشەویستی سوودت لە ژمارەیەکی زۆر لە شاعیران و نووسەران وەرگرتووە، بەڵام پێویستە سەرەتا لە فەیلەسوفانی تر بپرسین. لەژێر کاریگەری ئەم ڕاستییەدایت کە کەسانێکی زۆر کەم پەیوەندییەکی جددی بەرامبەر خۆشەویستی دەخەنە ڕوو، کاتێکیش ئەو فەیلەسوفانە گرینگی بەو پرسە دەدەن، نەیاریان دەکەیت. هۆکارەکەی چییە؟**

**ئالان بادیۆ:** بێگومان پەیوەندی نێوان فەیلەسوفەکان و خۆشەویستی بە هیچ شێوەیەك ڕوون و شەفاف نییە. کتێبەکەی ماری لۆمونیە و ئۆد لانسلین[1] لە ژێر ناونیشانی ***«فەیلەسوفەکان و خۆشەویستی: لە سوکراتەوە تا سیمۆن دووبۆڤوار»***[2] ئەم پرسەی بە ڕوونیی خستۆتە

١.Aude Lancelin and Marie Lemonnier

٢.Philosophers and Love from Socrates to Simone de Beauvoir

ڕوو. ئەم کتێبە بەو سەرسوڕمانەوە خەریکە کە تاوتوێی بیرکردنەوە و ژیانی فەیلەسوفەکان تێکەڵکیش دەکات، بێ ئەوەی کەمترین هەوڵ بەمەبەستی تێگەیشتنی پتر بۆ خوێنەری گشتی ئەنجام بدات. کتێبەکە لەم دیدەوە تاڕادەیەك بێ هاوشێوەیە. ئەوە دەخاتە ڕوو کە چۆن فەلسەفە لە کاتی هەبوونی خۆشەویستییدا لە نێوان دوو گۆشەی بەرامبەر یەکدا تووشی نسکۆ دەبێت، ئەگەر چی چەند ڕوانگەیەکی مامناوەندیش بوونی هەبێت. لە لایەك، فەلسەفەی «دژە خۆشەویستی»[٣] بوونی هەیە کە ئارسەر شۆپنهاوەر یەکەمین نوێنەرێتی. ئەو فەلسەفەیە بەوە ناسراوە کە لە شوێنێکدا دەنوسێت هەرگیز ژنان بە هۆی ئەزموونی سۆزی خۆشەویستییەوە هیچ نابەخشن؛ ئەوان لە ڕێگەی ئەم نەمرییەوە جۆری مرۆڤ وا لێ دەکەن کە لە ڕاستییدا بێ بایەخ بن! شوپنهاوەر بیرمەندێکی توندڕەوە. لە لایەکی تر، چەند فەیلەسوفێکی تریش هەن کە خۆشەویستی بۆ یەکێ لە باڵاترین ئاستی ئەزموونی سوبێکتی دەگۆڕن. بۆ نموونە، کییرکەگۆر لەم دەستە فەیلەسوفانەیە. لە دیدی کییرکەگۆر[٤]، بوون

---

٣. Anti Lov
٤. Kierkegaard

سێ ئاستی هەیە؛ لە ئاستی ئیستاتیکییدا، ئەزموونی خۆشەویستی ئەزموونێکە لە جۆری هەستبزواندن و دووبارەبوونەوەی پوچ و بەتاڵ. خودخوازییەکی چێژئاسا و خودخوازی هەر هەمان خودخوازی کەسەکان باس دەکات، کە ***دۆن ژوان لە ئۆپێرای مۆزارتدا*** نموونەی باڵای بوو. خۆشەویستی لە ئاستی ئاکارییدا، واقیعییە و جددیبوونی خۆی دەسەلمێنێت. خۆشەویستی لەم ئاستەدا بەڵێنێکی ناوەکیی ڕەهایە. بەو چەشنەی کییرکەگۆر لەبەر خۆشەویستەکەی خۆی ڕیگینی لاو[٥] ئەزموونی کرد. لە کاتێکدا بەهای ڕەهای ئەم بەڵێنە لە ڕێگەی هاوسەرگیرییەوە پشتڕاست دەکرێتەوە. ئاستی ئاکاری دەتوانێ ڕۆیشتن بەرەو باڵاترین ئاست کە ئاستی ئایینییە بخاتە ڕوو. بەم چەشنە، هاوسەرگیری نەك وەك هۆکاری ئاراستەکردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی لە بەرامبەر مەترسییەکانی خۆشەویستییەکی سەرکێشانە، بەڵکو وەك دامەرزاوەیەك دادەنرێت کە خۆشەویستی واقیعی بەرەو پێگە سەرەکییەکەی ئاڕاستە دەکات. دواین شێوەگۆڕینی خۆشەویستی ئەو کاتە ڕوودەدات کە «من (**Ego**) لە

---

٥.Young Regine
٦.Super-human

ڕوونکردنەوەی خۆییدا نقوم دەبێت بۆ ئەوەی ئەو دەسەڵاتە ببینێت کە ئەوی هێناوەتە کایەوە». واتە، ئەو کاتەی ئیگۆ لە ڕێز و زۆریی ئەزموونی خۆشەویستییدا ڕەگ و ڕیشەی خۆی لە سەرچاوە ئیلاهییەکەی دەدۆزێتەوە. ئەوکات خۆشەویستی بەرەو ئەودیوی سنورەکانی فریودان دەچێت و لە ڕێگەی میانگیری هاوسەرگیرییەوە بەئاسانی ئەتوانێ بگاتە پلەی سوپەرمرۆڤ[٦].

بەو چەشنەی کە دەیبینین، فەلسەفە بەدەست ناکۆکییەکی زۆر گەورەوە دەناڵێنێت. لە لایەك، خۆشەویستی وەك جۆرێك لە زیادەڕەوی سروشتی لە پەیوەندی سێکسی دەبینێت و، دەبێتە هۆی جۆرێك گومانی ئەقڵانی؛ لە لایەکی تر، پۆزشی خۆشەویستی دەبینین کە بەلایەنی کەمەوە لە دەرکەوتنی ئایینیدا نییە. مەسیحیەت کە ئایینی خۆشەویستییە، لە باکگراوندێکی هەڵواسراو دەمێنێتەوە و ئەم ناکۆکیەش تاڕادەیەك شایەنی قبوڵکردن نییە. لەم ڕووەوە، کییرکەگۆرد سەرەنجام ئەو کاتەی نەیتوانی پەی بە ئایدیای هاوسەرگیری لەگەڵ خۆشەویستەکەی ڕێگینا بەرێت، لێی جیا بۆوە و دواجار بوو بەو فریودانە ئیستاتیکییەی ئاستی یەکەم، بەڵێنی ئاکاریی دووەمین ئاستی بەجێهێنا و لە تێپەڕین بۆ ئاستی

سێیەم سەرکەوتوو بوو، ئەویش لە ڕێگەی جدیبوونی هاوسەرگیری لە ژیانی واقیعییدا نەبوو. ویڕای ئەوەش، ئەو، کۆی چوارچێوەی فۆرمە هەمەچەشنەکانی بیرکردنەوەی فەلسەفی ئەزموون کرد.

**پ: ئاخۆ بایەخپێدانی کەسییتان بەرامبەر ئەم پرسە بۆ هەنگاوە بەراییەکانی ئەفلاتوون دەگەڕێتەوە کە خۆشەویستی بە یەکێك لە شێوەکانی نزیکبوونەوە لە ئایدیا دادەنا؟**

**ئالان بادیۆ:** ئەفلاتوون لە بارەی خۆشەویستی زۆر بە وردی دەدوێت: توخمێکی یونیڤێرساڵ لە پاڵنەری جوڵان بەرەو خۆشەویستی هەیە. ئەزموونی خۆشەویستی هاندەرێکە بەرەو ئەوەی ئەفلاتوون بە ئایدیا لە قەڵەمی ئەدات. بەم چەشنە، تەنانەت ئەو کاتەی کە تەنیا ستایشی جەستەیەکی جوان دەکەم و بەس، جگە لەوەی کە خۆشم دەوێ یا نا، حەزم بە ئایدیایەکی جوانیشە. منیش، ڕێك بە وشە و دەستەواژەی تەواو جیاواز، هاوشێوەی ئەفلاتوون بیر دەکەمەوە، بەم مانایەی کە خۆشەویستی پێکدێت لە ئەزموونێکی تێپەڕی ئەگەریی لە ڕێکەوتبوونی پەتی شانسەوە بۆ ڕەوشێکی پڕبەهای گشتی. بە دەستپێکردنی

ڕووبەڕووبونەوەیەکی ڕووت، هەرچەند بێ بایەخیش، فێردەبیت دەتوانیت دنیا بە گوێرەی جیاوازییەکان، نەك تەنیا بەگوێرەی هاوشێوەییەکان ئەزموون بکەیت و تەنانەت ئەشێ لەم پرۆسەیەدا بۆ ئەزموونی ڕابردووش بگەڕێیتەوە و تووشی ئازاریش بیت. لە دنیای ئەمرۆدا، بە شێوەیەکی گشتی، وا وێنا دەکرێت کە کەسەکان تەنیا بەرژەوەندی کەسیی خۆیان دەوێت. خۆشەویستی چارەیەکە بۆ ئەم پرسە. خۆشەویستی، پێداگری لەسەر ئەمە دەکاتەوە کە تەنیا وەك ئاڵوگۆڕێکی دوولایەنە دانەنرێت یان بە هەر شێوەیەك، وەك سەرمایەکی سودویست لەبەرچاو نەگیرێت، بەڕاستی جۆرێك متمانە و دڵنیابوونێکی کەسییە کە لە بەخت و چارەنووسدا بوونی هەیە. خۆشەویستی بەرەو چەند بەشێکی دیاریکەری ئەزموونی شتە جیاوازەکانمان دەبات و، بەم ئایدیایە ڕێنماییمان دەکات کە ئەتوانرێ دنیا لە گۆشەی جیاوازەوە ئەزموون بکرێت. لەم چوارچێوەیەدا، خۆشەویستی چەند پەیامێکی گشتی و هەمەکی هەیە: خۆشەویستی ئەزموونێکی کەسییە لە یونیڤێرساڵییەکی بەزەبر و لەم ڕووەوە، لە فەلسەفەدا بایەخ و گرینگییەکی زۆری هەیە و ئەفلاتوونیش یەکەمین کەس بوو پەی بەو گرینگییە برد.

**پ: ژاك لاكانیش كە لای تۆ یەكێكە لە مەزنترین تیۆرەسازانی خۆشەویستی، كەوتە گفتوگۆییەكی جددی لەگەڵ دیدگاكانی ئەفلاتوون و، سەرەنجام بەوە گەیشت كە «پەیوەندی سێكسی بوونی نییە». مەبەستی لاكان لەمە چی بوو؟**

**ئالان بادیۆ:** گریمانەكەی ئەو زۆر سەرەنجڕاكێشە و لە ڕوانگەیەكی گومانخواز و ئاكارخوازەوە سەرچاوە دەگرێت، بەڵام ئەو ڕوانگەیەی ئەو بە ئاڕاستەی پێچەوانەوە دەسوڕێتەوە. ژاك لاكانیش ئەوە دەخاتە ڕوو كە لە پەیوەندی سێكسییدا هەموو كەسێك تاڕادەیەكی زۆر بە تەنیایە. بە دڵنیاییەوە، دەبێت جەستەیەكی تر لەئارادابێت، بەڵام سەرەنجام چێژ بەردەوام هەر چێژی تۆ دەبێت. پەیوەندی سێكسی جیا دەكاتەوە، یەك ناخات. ئەم ڕاستییەی كە تۆ ڕووتیت و فشار دەخەیتە سەر ئەویتر، ئەمە جۆرێك وێناكردن، جۆرێك ڕەنگدانەوەی خەیاڵییە. ڕاستییەكە ئەو چێژەیە كە تا پانتاییەكی یەكجار دوورەدەست دوورت دەخاتەوە. لەم ڕووەوە، لاكان بەم ئەنجامە گەیشت كە پەیوەندی سێكسی بوونی نییە. ئەم دادوەرییەی ئەو، هەمووان تووشی شۆك دەكات كە بۆچی لەو سەردەمەدا هەمووان تەنیا لەمەڕ «پەیوەندییە سێكسییەكان» دەدوێن.

ئەگەر هیچ پەیوەندییەکی سێکسی لە سێکسواڵیتدا نییە، خۆشەویستی ئەو شتەیە کە نائامادەیی پەیوەندییەکی سێکسی پڕ دەکاتەوە.
لاکان پێیوانییە کە خۆشەویستی سەرپۆشێکە بۆ پەیوەندییە سێکسییەکان؛ ئەو پێیوایە پەیوەندییە سێکسییەکان لە بنەڕەتدا بوونیان نییە، وەك ئەوەی خۆشەویستی هەمان ئەو شتەیە کە دەبێتە ئەلتەرناتیڤی لەدەستدانی ئەم پەیوەندییە. لە ڕاستیدا، ئەم شێوە تێگەیشتنە زۆر جێی سەرەنجترە. ئەم ئایدیایەی ئەو بەرەو دەربڕینی ئەم مانایەمان دەبات کە لە خۆشەویستی یەکلایەنەدا هەوڵ ئەدرێت بۆ ئەوەی لە «بوونی ئەویتر» نزیکتر ببینەوە. لە خۆشەویستییدا تاك بەرەو ئەودیوی خۆی، بەرەو ئەودیوی نەرجسی هەنگاو هەڵدێنێ. لە ڕاستیدا، لە پەیوەندی سێکسییدا، مرۆڤ لە ڕێگەی ناوبژیوانی ئەویترەوە، پەیوەندی لەگەڵ خۆی هەیە. ئەویتر لە ڕێگەی دۆزینەوەی ڕاستی چێژدا کۆمەکت دەکات. بە پێچەوانەوە، لە خۆشەویستییدا ناوبژیوانی ئەویتر لە خۆیدا کارێکی تەواوە. چییەتی ڕووبەڕووبونەوەی خۆشەویستییانە هەر ئەمەیە: مرۆڤ هەوڵ ئەدات ئەویتر وەك خۆی بێت و وای لێ بکات بەو چەشنەی کە هەیە بۆ ئەو بێت و، ئەم

تێگەیشتنە، لە بەراورد بەو ڕوانگە تەواو گاڵتەجاڕانەی کە خۆشەویستی پتر لە کەڤاڵێکی خەیاڵیی نەخشێنراو بەسەر هەوراز و نشێوی هەقیقەتدا دەڕوانێ، بە پەیوەندی سێکسی نازانێت، ئەمە تێگەیشتنێکی زۆر قووڵترە.
لە ڕاستیدا، لاکانیش لە پەیوەست بە خۆشەویستی دووچاری چەند دوالیزمێکی فەلسەفیی دەبێتەوە. ئەو ئایدیایەی کە «خۆشەویستی ئەو شتەیە کە نائامادەیی پەیوەندییەکی سێکسی پڕ دەکاتەوە « ئەشێ بە دوو شێوە ڕاڤە بکرێت. بە گوێرەی یەکەمین و بەڵگەنەویسترین ڕاڤە، خۆشەویستی ئەو شتەیە کە هێزێکی خەیاڵی بەکاردەهێنێت تاوەکو ئەو بۆشاییەی بەدیهاتووە لە ڕێگەی پەیوەندی سێکسییەوە پڕ بکاتەوە. هەر چی بێت. ئەمە تەواو ڕاستە کە پەیوەندی سێکسی هەرچەندە بەشکۆ بێت، بێگومانیش بەشکۆیە، تووشی جۆرێك لە پووچی و بەتاڵبوون دەبێتەوە، بە ڕاستی هەر لەبەر ئەم هۆیەیە کە شوێنکەوتەی یاسای دووبارەبوونەوەیە: دەبێت جار لە دوای جار دووبارە بکرێتەوە. ڕۆژانە، تا ئەو کاتەی کە گەنجین! ئەوکات خۆشەویستی لە شێوەی ئەم ئایدیایە جێی دەبێتەوە کە شتێك لەم بۆشاییەدایە و ئەوینداران (Lover) لە ڕێگەی شتێکی جگە لەم پەیوەندییە

تێگەیشتنە، لە بەراورد بەو ڕوانگە تەواو گاڵتەجاڕانەی کە خۆشەویستی پتر لە کەڤاڵێکی خەیاڵیی نەخشێنراو بەسەر هەوراز و نشێوی هەقیقەتدا دەڕوانێ، بە پەیوەندی سێکسی نازانێت، ئەمە تێگەیشتنێکی زۆر قووڵترە.

لە ڕاستیدا، لاکانیش لە پەیوەست بە خۆشەویستی دووچاری چەند دوالیزمێکی فەلسەفیی دەبێتەوە. ئەو ئایدیایەی کە «خۆشەویستی ئەو شتەیە کە نائامادەیی پەیوەندییەکی سێکسی پڕ دەکاتەوە « ئەشێ بە دوو شێوە ڕاڤە بکرێت. بە گوێرەی یەکەمین و بەڵگەنەویسترین ڕاڤە، خۆشەویستی ئەو شتەیە کە هێزێکی خەیاڵی بەکاردەهێنێت تاوەکو ئەو بۆشاییەی بەدیهاتووە لە ڕێگەی پەیوەندی سێکسییەوە پڕ بکاتەوە. هەر چی بێت. ئەمە تەواو ڕاستە کە پەیوەندی سێکسی هەرچەندە بەشکۆ بێت، بێگومانیش بەشکۆیە، تووشی جۆرێك لە پووچی و بەتاڵبوون دەبێتەوە، بە ڕاستی هەر لەبەر ئەم هۆیەیە کە شوێنکەوتەی یاسای دووبارەبوونەوەیە: دەبێت جار لە دوای جار دووبارە بکرێتەوە. ڕۆژانە، تا ئەو کاتەی کە گەنجین! ئەوکات خۆشەویستی لە شێوەی ئەم ئایدیایە جێی دەبێتەوە کە شتێك لەم بۆشاییەدایە و ئەوینداران (Lover) لە ڕێگەی شتێکی جگە لەم پەیوەندییە

نائامادەیە پێکەوە دەبەستێتەوە.

ئەو کاتەی زۆر گەنج بووم بە خوێندنەوەی بەشێك یان پەرەگرافێك لە کتێبی ***ڕەگەزی دووەمی سیمۆن دووبۆڤوار*** زۆر کاریگەر بووم. ئەو لەم پەرەگرافەدا باسی لەوە دەکرد کە پیاو پاش تەواوبوونی پەیوەندی سێکسی، جەستەی ژن بە پان و شل و شڕ وەسف دەکات و لە بەرامبەریشدا ژن وا هەست دەکات کە جەستەی پیاو، جگە لە کێری، بەشێوەیەکی گشتی سەرەنجڕاکیشییەکەی لەدەستداوە و تەنانەت کەمێکیش پێکەنینانەوییە. ڤاودوێلیش لە شانۆیەکییدا بەسوودوەرگرتن لە چەند بیرکردنەوەیەکی هاوشێوە دەمانهێنێتە پێکەنین. ئارەزووی پیاو ئارەزووە بۆ دنیای گاڵتەجاری، ورگزلی و کێری بێتوانا و، پیرەژنی ساحیری بێددان بەهۆی مەمکەکانییەوە ئاوێزانی داهاتووە کە چاولەڕێی تەواوی ئەو جوانییەیە. نەرمی و تەڕوبەری خۆشەویستی ئەو کاتەی کە لە نێو داوێنی ئەویترەوە خەوی لێدەکەوێت وەك باڵاپۆشی نوحە (**Noah**) کە لەسەر ئەم بیرکردنەوە نیگەرانییە جێگیر بووە، بەڵام لاکان ڕێك بە پێچەوانەوە بیر دەکاتەوە. لە دیدی لاکان، خۆشەویستی بەرەو پانتایی ئۆنتۆلۆژییانە دەستدرێژ دەکات. لە کاتێکدا کە ئارەزوو بەردەوام بە شێوەیەکی تاڕادەیەکی

فیتیشیست (**fetishist**)، سەرەنجی خۆی لەسەر بەشە تایبەتەکانی ئەویتر وەك مەمکەکان، سمتەکان و ئامرازی سێکس جێگیر دەکات، خۆشەویستی سەرەنجی خۆی ڕێك لەسەر بوونی ئەویتر جێگیر دەکات، ئەو ئەویترەی کە بەتەواوی چەکدارە بەرامبەر بوونی خۆی، بۆ ناو ژیاندام، کە بەم چەشنە تێکشاوە و گۆڕدراوە، دەرکەوتووە.

**پ: لە ڕاستییدا پێتانوایە چەندان ڕاڤەی فەلسەفیی زۆر پێکدژ لەبارەی خۆشەویستی بوونی هەیە؟**

**ئالان بادیۆ:** لە بنەڕەتدا سێ ڕاڤە هەیە. یەکەم ڕاڤەیەکی ڕۆمانتیکییە کە لەسەر شەیدایی ڕووبەڕووبونەوە جێگیر دەبێت. دووەمین ڕاڤە هەر هەمان ئەو ڕاڤەیە کە لەبارەی ئاژانسی دۆزینەوی هاوڕێی میتیك ئاماژەم پێکردووە؛ ئەو ڕاڤەیەی کە بە گوێرەی ڕوانگەیەکی یاسایی یان بازرگانی کە دەریدەخات خۆشەویستی دواجار دەبێت جۆرێك پەیمان بێت. پەیمانێك لە نێوان دوو کەسی ئازاد کە ڕایدەگەیەنن خۆشەویستی یەکترن، ئەگەر چی هەرگیز زەرورەتی یەکسانی لە پەیوەست و سیستەمی بەرژەوەندییە دوولایەنەکان و .... فەرامۆش ناکەن. سەرەنجام، ڕاڤەیەکی گومانگەرایانەیە کە خۆشەویستی

بۆ جۆرێك وەهم دەگۆڕێت. من لە ڕوانگەی فەلسەفیی کەسیمەوە هەوڵئەدەم بڵێم خۆشەویستی ناتوانێ بۆ هیچ یەك لەم لێکچوونانە کورت بکرێتەوە، بەڵکو گەڕانێکە بۆ دۆزینەوەی هەقیقەت. دەپرسیت: چ جۆرە هەقیقەتێك؟ مەبەستم ئەو هەقیقەتەیە کە بەتایبەت شتێکی تەواو ڕوون و وردە: کاتێ کەسێك جیهان نەك لە گۆشەنیگای «یەك»ـەوە کە لە گۆشەنیگای «دوو» ئەزموون دەکات چ جۆرە جیهانێك دەبینێت؟ ئەو جیهانە لە پێش چاو بگرە کە نەك لە گۆشەنیگای جیاوازی و شوناس کە لە گۆشەنیگای جیاوازەوە ئەزموون دەکرێت، و گەشە و پەرەدەستێنێت و فەرامۆش دەکرێت. جیهانێکی ئاوها چ جۆرە جیهانێکە؟ من پێموایە خۆشەویستی دەبێ بەم چەشنە بێت. خۆشەویستی ئەو پرۆژەیە کە تەواوی لایەنەکانی ئارەزووی سێکسی دەگرێتەوە. بۆ نموونە: لەدایکبوونی منداڵ و هەزار و یەك شتی تر، لە ڕاستیدا، هەموو شتێك لە ساتەوەختێك کە ژیانمان لە گۆشەنیگای جیاوازەوە تووشی کێشە و قەیران دەبێتەوە.

**پ: بە ڕەچاوکردنی بیروڕاکانت و بە پشتبەستن بەوەی کە خۆشەویستی بە ڕێگایەك بۆ ئەزموونی جیهان بەگوێرەی جیاوازی دەزانیت، بۆچی لەگەڵ ئیمانوێل لێڤیناس**

**هاوده‌نگ نیت کاتێ که ده‌ڵێت: «عاشق له‌و که‌سه‌ی خۆشی ده‌وێت (معشوق)، نه‌ك تایبه‌تمه‌ندییه‌کی جیاواز له‌گه‌ڵ ئه‌وانیتر، به‌ڵکو تایبه‌تمه‌ندییه‌کی جیاواز ئه‌زموون ده‌کات»؟ بۆچی ئه‌وه قبووڵ ناکه‌یت که خۆشه‌ویستی ئه‌زموونێکی تره؟**

**ئالان بادیۆ:** به‌دیدی من، په‌یبردن به‌مه‌ی که بیناکردنی جیهان به‌گوێره‌ی جیاوازی به‌ده‌ر له ئه‌زموونی جیاواز، کارێکی پێویسته. خه‌یاڵی لڤیناس له ئه‌زموونی ڕاڤه‌نه‌کراوی شێوه‌ی ئه‌ویتره‌وه ده‌ست پێده‌کات، جۆریك ده‌رکه‌وتن که به‌گوێره‌ی خوداوه‌ند وه‌ك «ئه‌ویتری به‌هێز» جێگیر بووه. ئه‌زموونی ئه‌ویتریوون بایه‌خێکی یه‌کجار زۆری هه‌یه، له‌به‌رئه‌وه‌ی به‌ردی بناغه‌ی زانستی ئاکاره. له هه‌ر نه‌ریتێکی ئایینی باڵادا، خۆشه‌ویستی وه‌ك جۆرێك له هه‌ستی ئاکاریی به‌ته‌واوی مانا ده‌رده‌که‌وێت. به دیدی من، هیچ شتێکی ئاکاریی به‌تایبه‌ت له‌مه‌ڕ خودی خۆشه‌ویستی بوونی نییه. له ڕاستیدا، من حه‌زم له هیچ یه‌ك له‌م بیرکردنه‌وه ئیلاهیاتییانه‌ی که به سوودوه‌رگرتن له خۆشه‌ویستی هاتونه‌ته کایه‌وه، نایه‌ت؛ ئه‌گه‌ر چی ده‌زانم کاریگه‌رییه‌کی قووڵیانیش له‌سه‌ر مێژوو هه‌یه. ته‌نیا ئه‌و شته‌ی که دیاریده‌که‌م دوا ڕه‌خنه‌ی «یه‌ك»ـه

له «دوو». پێموایە ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ ئەویتر بەڕاستی هەیە، بەڵام ڕووبەڕووبونەوە جۆرێك لە ئەزموون نییە، ئەو ڕووداوەیە کە بەئاڵۆزی دەمێنێتەوە و هەقیقەت تەنیا لە دوو توێی زایەڵەی هەمەجۆر لە جیهانی واقیعییدا دەردەکەوێت. بۆیە ناتوانم خۆشەویستی بە ئەزموونی (هاوبەشیکردن) بزانم، واتە ئەزموونێك کە تێیدا خۆمان بە هۆی ئەویتر فەرامۆش بکەین؛ ئەمە مودێلی ئەم جیهانەیە لەوەی سەرەنجام بەرەو «ئەویتری بەهێز» ڕینمونی دەکات. پێشتریش ***گۆتە*** لە کۆتایی کتێبی ***فاوست*** ئەوەی پشتڕاستکردۆتەوە کە «ژنانەیی جاویدان بە لوتکەمان دەگەیەنێت». بەداخەوە، من گوزارەی لەم چەشنە تاڕادەیەك بە ناپەسەند دەزانم. بەڕاستی خۆشەویستی نە بە «لووتکە» و نە بە «نشێو»ـم ناگەیەنێت. خۆشەویستی پرۆژەیەکی وجودییە: بەمەبەستی بیناکردنی دنیا لە گۆشەنیگایەکی ناسەنتەریزمەوە، جگە لە پاڵنەری پەتیی من بۆ مانەوە یان پاڵپشتیکردنی سەرلەنوێی شوناسی خۆمان.

لێرەوە «ئەزموون» و «بیناکردن» لەبەرامبەر یەك دادەنێم. کاتێ پشتئەستوورم بە لاملەکانی ئەو ژنەی خوشمدەوێت، و ئارامیی بەرەبەیان بەسەر نشێوی ئاسۆی

کێو، و سەوزەڵان و مەزرای گەنم، سێبەری درەختەکان، مەڕی سەرڕەشی بێ جموجوڵەی پشت حەسارەکان و، خۆر لە کاتی ئاوابوونی لە نێوان لوتکە و گردەکان دەبینم؛ و دەزانم، نەك لە ڕووی دۆخی سیماکەیەوە، بەڵکو لە ڕووی جیهان بەو چەشنەی کە هەیە، کە ئەویش هەر ئەم جیهانە دەبینێت و ئەم یەکانگیرییە بەشێکە لە جیهان؛ و دەشزانم کە ڕێك لە هەمان ساتدا، خۆشەویستی بریتییە لە پارادۆکسی جۆری جیاوازییەکی هەماهەنگ؛ لەبەرئەوەیە خۆشەویستی بوونی دەبێت و سەرهەڵدەدات درێژە بە بوون دەدات. ڕاستییەکە ئەمەیە کە هەنووکە من و ئەو دەرگیری بابەتێکی بێهاوتایانەین. بابەتی خۆشەویستی، کە بینینی جیهان لە پانۆرامای شووشەییانەی جیاوازییەکانەوە دەخاتەڕوو. بەم چەشنە، دەتوانیت پەی بەم جیهانە بەریت، لەدایك بیت و نەبیتە ڕەنگدانەوەیەکی سادەی پڕکردنەوە و زاڵکردنی تێڕوانیینە کەسییەکانت. خۆشەویستی توانای هەمیشەیی ئامادەبوونە لە لەدایکیوونی جیهاندا. لەدایکبوونی منداڵ بەو چەشنەی لە چوارچێوەی خۆشەویستی لەدایك ببێت، هەمدیس نموونەیەکی ترە لەم توانایە.

**پ: هەنووکە با لە تێگەیشتنتان بۆ خۆشەویستی بڕوانین. گوێم لێبووە کە ڕامبۆ دەیویست خۆشەویستی سەرلەنوێ دابهێنێتەوە، بەڵام بەهەمان مەبەست دەبێ لە کام ئایدیا لەبارەی خۆشەویستی دەستپێبکەینەوە؟**

**ئالان بادیۆ:** من پێموایە دەبێت خۆمان لە دوو خاڵەوە لە پرسی خۆشەویستی نزیك بکەینەوە کە لەگەڵ ئەزموونی هەمووان تەبایە. خاڵی یەکەم، خۆشەویستی لەخۆگری چەشنێك دابڕان یان هەڵوەشانەوەیە، ئەویش بەگوێرەی جیاوازی پەتی نێوان دوو تاك و سوبێکتە ناکۆتاکان. لە زۆربەی بوارەکاندا، ئەم دابڕانە، جیاوازی سێکسییە. ئەگەر شتێکی لەم چەشنە ڕاستیش نەبێت، خۆشەویستی هێشتا پشتڕاستمان دەکاتەوە کە دوو کەس، واتە دوو هەڵوێستی ڕاڤەکردنی جیاواز، لە بەرامبەر یەك ڕادەوەستن. بە دەربڕینێکی تر، خۆشەویستی هەڵگری توخمێکی بەراییە کە جیای دەکاتەوە، پێش و پاش دەکات و جیاوازی

دەکات. سەروکارت لەگەڵ «دوو»ـدا هەیە. خۆشەویستی لە دوو پێکدێت.
خاڵی دووەم، بریتییە لەوەی کە ڕێك لەو ساتەی ئەم «دوو»ـە لە خۆیدا، بە مانای واقیعی وشەکە، لەسەر شانۆ دەردەکەون و جیهان لە ڕێگەیەکی تازەوە ئەزموون دەکەن، ئەمەش ئەشێ فۆرمێکی پرمەترسی یان ڕووداو بێت، ئەویش بەهۆی ئەوەی دابڕان بەردەوام لە ئارادایە. ئەمە هەمان ئەو شتەیە کە ئێمە بە «ڕووبەڕووبونەوە» لە قەڵەمی ئەدەین. خۆشەویستی بەردەوام بە چەشنێ ڕووبەڕووبونەوە دەست پێ دەکات، من پێگەی نیمچەمیتافیزیکی ڕووداوێك بەم ڕووبەڕووبونەوەیە دەبەستمەوە، واتە ئەو شتەی کە ناچێتە نێو سیستەمی بێ پێچ و پەنای شتەکانەوە. چەندان نموونەی بێ هەژمار لە هونەر یان ئەدەبیاتدا هەیە کە خەریکی وەسفکردنی خاڵێکی دەستپێکی لەم چەشنە دەبێت. زۆربەی چیرۆك و ڕۆمانەکان جەخت لەسەر ئەم خاڵە دەکەنەوە کە تێیدا بە دیاریکراوی لە «دوو»ـدا بەرجەستە دەبێت، تا ئەو شوێنەی کە دوو ئاشق پەیوەست نین بە چین، گرووپ، خێڵ یان وڵاتێکی دیاریکراوەوە. **ڕۆمیۆ و جوڵێت** ***«Romeo and Juliet»*** تەمسیلیکردنی ڕاستەقینەی ئەم دابڕانەیە، بەتایبەت لەبەرئەوەی ئەم

«دوو»ـە پەیوەندی بە ئۆردوگاکانی دوژمنەوە هەیە. نابێ ئێمە دەسەڵاتی خۆشەویستی لە کەلێن و تێپەڕین لە نێو پردەسەڵاتترین نەیاری و بنەڕەتیترین دابڕانەکان بەکەم وەربگرین. ڕووبەڕووبونەوەی نێوان دوو جیاوازی، چەشنێك ڕوداوە و، لە هەمان کاتدا، شانۆیەکی پڕ دەنگە دەنگی «سوپرایزەکانی خۆشەویستی»ـشە. بە گوێرەی ئەم ڕووداوە، خۆشەویستی دەتوانێ دەستپێك و گەشاوە بێت، بە ڕەهایی، ئەمەش یەکەمین خاڵی بنەڕەتییە. ئەم سوپرایزە پرۆسەیەك دێنێتە پێشەوە کە لە بنەڕەتدا ئەزموونێکە لە پێناو ناسینی جیهان. خۆشەویستی لەبارەی دیداری دوو کەس و پەیوەندییە ناوەکییەکانیان نییە. خۆشەویستی چەشنێك بیناکردنە، ئەو ژیانەیە کە بینا دەکرێت، بەڵام نەك تەنیا لە ڕووانگەی «یەکەوە»، بەڵکو لە ڕوانگەی «دووەوە»، ئەمە هەمان ئەو شتەیە کە من بە «سەکۆی شانۆی دوو» لە قەڵەمی ئەدەم. من هەمیشە پەیوەستم بە پرسەکانی کات و پرۆسەوە، نەك تەنیا خاڵەکانی دەستپێکردن.

**پ: بە گوێرەی بۆچوونەکانت، ناکرێ خۆشەویستی لە دیدارێکدا قەتیس بکرێت، بەڵکو لە دوو توێی کاتدا بۆ خۆی دروست دەبێت. بۆچی ڕاڤەکردنێکی تێکەڵ بۆ خۆشەویستی ڕەت دەکەیتەوە؟**

**ئالان بادیۆ:** بە بڕوای من، زۆر کەس بە جۆرێك بڕوایان بە تێگەیشتنی ڕۆمانتیکانە بۆ خۆشەویستی هەیە کە بە ڕێگایەك خۆشەویستی بە موستەحیل دادەنێن. خۆشەویستی لە دوو توێی دیدار و لە ساتێکی سەحراوی، لە دەرەوەی واقیعەتی دنیای هەیی، لەو یەکەیەدا هەڵدەهێنجرێت، بەلوتگە دەگات و لە نێو دەچێت. شتێك ڕوودەدات کە لە خودی هەر موعجیزەیەکدا جێی دەبێتەوە، ئارەزوویەکی وجودی، ڕووبەڕووبونەوەیەك کە تووشی شکست و ڕووخان دەبێت، بەڵام کاتێ ڕەوشەکە بەو لوتگەیە دەگات، ئێمە نەك یەك «سەکۆی شانۆی دوو»، بەڵکو جۆرێك لە «سەکۆی شانۆی یەك»ـمان بەرچاو دەکەوێت. ئەم چەمکە ڕووخانی خۆشەویستییە: دوو ئاشق یەکتر دەبینن و شتێکی وەك کردەیەکی قارەمانانە بۆ پشتگیری لە «یەك»، دژی جیهان جێبەجێ دەکەن. لە ئەفسانە ڕۆمانتیکەکاندا دەبینین کە ئەم ساتی ئاوێزانبوونە

زۆرجار بە مەرگ کۆتایی پێدێت. لە نێوان خۆشەویستی و مەرگدا پەیوەندییەکی نزیك و قووڵ بوونی هەیە؛ بێگومان خاڵی لوتکەی پەیوەندی ***تریستان و ئیزولدەی Tristan» «and Isolde ڕیشارد ڤاگنەرە***، لەبەرئەوەی خۆشەویستی لە ساتی لەناکاو و وەسفنەکراوی ڕووبەڕووبونەوە کۆتایی پێدێ و لە نێو دەچێت، لە دوای ئەوە، گەڕانەوە بۆ دنیای دەرەوەی پەیوەندی کارێکی نەکردەیە.

ئەمە ڕاڤەیەکی ڕۆمانتیکی ڕادیکاڵە کە بەدیدی من، دەبێت بەرپەرچی بدەینەوە. ئەم ڕاڤەیە جوانییەکی هونەرمەندانە و نائاسایی هەیە، بەڵام بە بڕوای من، لەڕووی ئۆنتۆلۆجییەوە بەجددی شایەنی پەسەندکردن نییە، بەدیدی من، دەبێت بە ئەفسانەیەکی هونەریی و جێ سەرەنجی بزانین، نەك فەلسەفەیەکی ڕاستەقینە لەبارەی خۆشەویستی. وێڕای ئەوەش، خۆشەویستی لە دنیادا لە دۆخی ڕوواندایە؛ خۆشەویستی ئەو ڕووداوەیە کە پێشبینی و بەهاکەی بەگوێرەی یاساکانی دنیا کارێکی نەکردەیە. هیچ شتێك (تەنانەت سایتی میتیك و سایتە یەکترناسینییەکانی تریش) وا لە کەس ناکات بۆ ئەوەی ڕووبەڕووبونەوەیەکی هەرلەخۆوە ڕێکبخات. سەرەنجام، ئەو ساتەوەختەی کە یەکتری بە زیندوو و ئامادە دەبینیت،

ئیدی یەکترتان بینیوە و کار لەکار ترازاوە، هەموو شتێك تەواو بووە و لە کۆنترۆڵی تۆ بەدەرە. وێڕای ئەوەش، ناشێ خۆشەویستی بۆ ڕووبەڕووبونەوەی یەکەم کورت بکرێتەوە، لەبەرئەوەی خۆشەویستی جۆرێکە لە بیناکردن. ڕەمز و ڕازەکانی بیرکردنەوە لە خۆشەویستی، پێویستی بە کاتە بۆ شکۆفەکردن. لە ڕاستیدا، خۆشەویستی سەرچاوە سەرنجڕاکێشەکانی سەرەتاکان نییە، ئەو سەرەتاییانە بە ڕوونی ویژدانهەژێنە، بەڵام خۆشەویستی لە هەموو شتێك گرینگتر جۆرێکە لە بیناکردن کە بەردەوام دەبێت. ئەشێ بڵێین، خۆشەویستی جۆرێکە لە سەرکێشییەکی سەرسەختانە. لایەنی سەرکێشییەکی سەپێنەرانەیە ڕێك بە ڕادەی پێویستی بە سەرسەختی. تەسلیمبوون بەرامبەر گەیشتن بە یەکەمین بەربەست، یەکەمین ناتەبایی جددی و یەکەمین کێشە، شتێکی جگە لە شێواندنی خۆشەویستی نییە. خۆشەویستی واقیعی ئەو خۆشەویستییەیە کە بەشێوەیەکی پتەو و بەردەوام، هەندێ کاتیش بەئازار، بەسەر بەربەستەکانی شوێنکات و جیهان دەستباڵا دەبێت.

**پ: ئەمە چ جۆرە بیناکردنێکە؟**

**ئالان بادیۆ:** کتێبی چیرۆك لەم بوارەدا بەتەواوی نایاب و خامۆشن، بەم چەشنە نییە؟ کۆتایی چیرۆکە دەڵێت «ئەوان هاوسەرگیرییان کرد و چەند منداڵێکیان هەبوو». بەڵێ، هەڵبەتە، بەڵام ئاخۆ خۆشەویستی بریتییە لە هاوسەرگیری و هەبوونی منداڵی زۆر؟ لێکدانەوەیەکی لەم چەشنە، تاڕادەیەك ڕواڵەتی و گاڵتەجاڕانەیە. ئەم وێناکردنەی کە خۆشەویستی بە درووستکردنی ناوەندی خێزان دێتە کایەوە و بە ئەنجام دەگات، هەرگیز ڕازیکەر نییە. نەك بەم هۆیەی کە ناوەندی خێزان ڕۆڵێکی ئەوتۆی لە خۆشەویستییدا نییە؛ بە بڕوای من، ناوەندی خێزان لە خۆشەویستییدا کاریگەرە، بەڵام خۆشەویستی ناشێ بەو جۆرە کورت بکرێتەوە. دەبێت ئەوە بزانین کە لەدایکبوونی منداڵ بەشێکە لە خۆشەویستی، بەڵام لە هەمان کاتدا، نابێ پێمانوابێ لەدایکبوونی منداڵ دوا ئامانج و مەبەستی خۆشەویستییە. بەڕاستی ئەو ساتەی کە خۆشەویستی دەوام دەهێنێت بۆم گرینگە. ڕێکتر بڵێم: لە «سەقامگیربوونی» خۆشەویستی نابێ بەو چەشنە لێی تێبگەین کە خۆشەویستی بەردەوام دەبێت و هەمیشەیی یان ئەبەدییە. دەبێ ئەوە زانین کە خۆشەویستی بۆ

بەردەوامیدان بە ژیان ڕێگەگەلی جیاواز دادەهێنێت. دەبێ ئاگامان لەوە بێت کە هەبوونی هەمووان، کاتێ لەلایەن خۆشەویستییەوە لە بۆتەی تاقیکردنەوەدا دابنرێت، ڕێگایەکی تازە بۆ گوزەراندنی تەمەنی دواتری خۆی دەبینێت. هەڵبەتە، بەو چەشنەی لاسایی شاعیرەکان بکەینەوە، دەبێت ئەوە بڵێین خۆشەویستی «ئارەزوویەکی بەهێزە بۆ سەقامگیربوون»، بەڵام خۆشەویستی، لەوەش زیاتر، ئارەزووە بۆ ماوەیەکی نەناسراو، چونکە بەو چەشنەی کە هەموومان دەزانین، خۆشەویستی دووبارە داهێنانەوەی ژیانە؛ و سەرلەنوێ داهێنانەوەی خۆشەویستی هەر هەمان سەرلەنوێ داهێنانەوەی ئەو داهێنانە دووبارەیە.

**پ: لە کتێبێکتاندا بە ناونیشانی «*هەلومەرجەکان*» «*Conditions*» چەندان ئایدیا لەمەڕ نەمریی خۆشەویستی دەخەیتە ژێر پرسیار و گومانەوە، بەتایبەت ئەو ئایدیایەی کە هەستی ئاشقبوون جۆرێکە لە وەهم و چەمکێکی سێنتراڵە لە ترادیسیۆنی بەدبینانەی مۆرالیستە فەرەنسییەکان کە بە گوێرەی ئەو دیدە، خۆشەویستی هیچ نییە جگە لە «رازانەوەیەکی تیژبینانە کە لە ڕێگەیەوە هەقیقەتی پەیوەندی سێکسواڵی خۆی دەردەخات»**

**یان «خۆشەویستی لە بنەڕەتدا ئارەزوو و بەپەرۆشیی سێکسوالیتییە». بۆچی ئەم تێگەیشتنە دەخەیتە بەر ڕەخنەوە؟**

**ئالان بادیۆ:** ئەم چەمکە ئاکارییە پەیوەستە بە نەریتی گومانگەرایی. ئەم فەلسەفەیە بانگەشەی ئەوە دەکات کە خۆشەویستی لە ڕاستییدا بوونی نییە و تەنیا سەرپۆشێکە بۆ ئارەزووی سێکسی. ئارەزوو تەنیا ئەو شتەیە کە بەڕاستی بوونی هەیە. بەگوێرەی ئەم تێڕوانینە، خۆشەویستی ئەو شتەیە کە هێزی خەیاڵکردنەوە درووست دەکات تاوەکو ئارەزووی سێکسی بگەشێنێتەوە. ئەم ئایدیایەی کە پێشینیەکی دوورودرێژی هەیە، هەمووان بۆ گومانبردن بەرامبەر بە خۆشەویستی هان ئەدات و، بە فەرهەنگێکەوە پەیوەستە کە ئاسایشی پێش هەموو شتێك خستووە، چونکە لە بنەڕەتدا بەو مانایەیە کە: «گوێ بگرە، لە شێوەی هەبوونی ئارەزووە سێکسییەکانیان تێبگەیت، بەڵام پێویست نییە لە دەسیسەی ئەم وێناکردنە گرفتار بیت کە ناچاریت کەسێکت خۆشبوێت. تەنیا ئارەزووەکانتان تێر بکەیت و تەواوی شتەکان فەرامۆش بکەیت!» بەڵام لەم شێوەیەدا، دەبێ بڵێم کە خۆشەویستی سوکایەتی پێ دەکرێت (یان نۆژەندەکرێتەوە بەو جۆرەی تۆ دەتەوێ)

ئەوەش بەناوی هەقیقەتی پەیوەندی سێکسی.
لەم چوارچێوەیەدا دەمەوێ ئاماژە بە ئەزموونی خۆم بکەم. منیش وەك هەر کەسێکی تر بە بەڕێوەبردن و پێداگری ئارەزووی سێکسی ڕاوەستام و بیرم لێ کردۆتەوە. سات تێناپەڕێت لەبیری بکەم. هەروەها دەزانم خۆشەویستی بەدیهاتنی ئەم ئارەزووە لە ڕەوتی گەشەسەندن و وەرچەرخانی خۆییدا جێگیر دەکات، ئەمەش زۆر گرینگە، چونکە بەو چەشنەی کە ئەدەبیات لە دێرزەمانەوە بانگەشەی بۆ دەکات، بەدیهاتنی ئارەزووی سێکسی وەك ئەرکێکی بێهاوشێوە کاردەکات و نموونەیەکە کە ئاڕاستەیەکی جەستەیی و تەواو سێکسییانە پیشان ئەدات، خۆشەویستی شتێکی پترە لە ڕاگەیاندنی وشە پەتییەکان. ڕاگەیاندنێك لە جۆری «خۆشم دەوێی»، لەو ڕووەوە کە بەها بە کردەی ڕووبەڕووبونەوە ببەخشێت، بایەخی زۆری هەیە و، جۆرێك پەیمانبەستن دەخولقێنێت، بەڵام تەسلیمبوونی جەستەتان، داکەتنی پۆشاکەکانتان، ڕووتبوون بۆ ئەویتر، دووبارەبوونەوە و ڕاهێنانیی خۆنوێنە پیرۆزەکان، بەلاوەخستنی هەر چەشنە شەرم و خەجاڵەتیەك، هاوارکردن و خرۆشاندن، تەواوی ئەم دەرگیرییانەی جەستە، گوزارشتە لە تەسلیمبوون

بەرامبەر خۆشەویستی. خۆشەویستیی تەواو و بنجبڕ، خۆی لە هاوڕێیەتی جیا دەکاتەوە. هاوڕێیەتی پەیوەست نییە بە پاپەندبوونی جەستەیی یان ڕەنگدانەوە لە چێژی جەستەدا. بەم هۆیەیە کە هاوڕێیەتی بۆتە جێ باسی ئەو بیرمەند و فەیلەسوفانەی کە بەرامبەر بە سۆزی شەهوەتی بەدگومانن، بەردەوام ئەو بابەتە دێننە پێشەوە. خۆشەویستی بە تایبەت بە تێپەرینی کات، تەواوی لایەنە ئەرێنییەکانی هاوڕێیەتی دەگرێتەوە، بەڵام خۆشەویستی بە گشتێتی بوونی ئەویترەوە پەیوەست دەبێت و پاپەندبوونی جەستە ڕەمزی لاشەییەکەی دەبێتە گشتێتی. دەتوانین بڵێین: «راست نییە! ئەوە تەنیا و تەنیا ئارەزووە کە لە خۆشەویستییدا کاردەکات.» پێموایە ڕاگەیاندنی خۆشەویستی لە چوارچێوەی ئەو خۆشەویستییەی کە خۆی ڕایدەگەیەنێت، تەنانەت ئەگەر شاراوەش بێت، هۆکاری بەدیهاتنی بەرهەم و ئەنجامەکانی ئارەزووە، بێ ئەوەی کە خودی ئەم ئارەزووە دەربکەوێ. خۆشەویستی بە کاریگەری لە ئارەزوودا خۆی دەسەلمێنێت و ڕێورەسمی جەستەکان دەرخەری لاشەیی ئەم مانایە. هەروەها دەرخەری ئەم ئایدیایە کە بەڵێنی سەرلەنوێ داهێنانەوەی ژیان سەرەتا لە ڕووی جەستەییەوە بەدی دێت، بەڵام

ئاشقەکان تەنانەت لە توندترین دۆخە شێواوەکانیشدا، ئەوە دەزانن کە خۆشەویستی وەك فریشتەی پاسەوانی جەستەیان ئامادەیی هەیە؛ کاتێ بەرەبەیان لە خەو هەڵدەستیتەوە، و کاتێ جەستەکانتان ئارام دەبێتەوە، خۆشەویستی ڕاگەیەندراوە.

بەم هۆیەیە من پێموایە خۆشەویستی، جگە لەو تیۆرەسازانەی کە لە هەوڵی تەماویکردنی ناوەرۆکەکەین، داپۆشەرێکی پەتیی بۆ ئارەزووی سێکسی و پێشەکییەکی پڕدەنگەدەنگ و وەهمییانە نییە بەمەبەستی دەستەبەرکردنی مانەوەی جۆری مرۆڤ.

**پ: پێشتر باست لەوە کردووە کە ئەفلاتوون سەردەمانێك لەمەوپێش ئەو پەیوەندییە تایبەتەی کە لە نێوان خۆشەویستی و هەقیقەتدا هەیە، باسکردووە. بەڵام بە دیدی تۆ خۆشەویستی چۆناوچۆن بەشێکە لە «شێوەی هەقیقەت»؟**

**ئالان بادیۆ:** پێموایە خۆشەویستی هەمان ئەو شتەیە کە من بە گوێرەی لێکدانەوە فەلسەفییەکانم بە «شێوەی هەقیقەت» لە قەڵەمم داوە، واتە ئەو ئەزموونەی کە بە هۆییەوە جۆرێك لە هەقیقەت دروست دەبێت. ئەم هەقیقەتە بێ هیچ گومانێك هەقیقەتێکە لەبارەی «دوو»: ئەو هەقیقەتەی کە لە خودی جیاوازییەوە سەرچاوە دەگرێت و پێموایە خۆشەویستی (واتە ئەوەی من پێیدەڵێم سەکۆی دوو) هەر هەمان ئەزموونە. بەم مانایە، سەرتاپای ئەو خۆشەویستییەی کە تووشی قەیران بۆتەوە پەیوەستە بە تۆکمەییەکەی، و بە پەسەندکردنی ئەزموونی دنیا

لە گۆشەی جیاواز، لە ڕەوتی هەقیقەتێکی تازە لەبارەی جیاوازی دێتەکایەوە.

بەم هۆیەیە کە خۆشەویستی واقیعی بەردەوام بۆ تەواوی مرۆڤایەتی جێی سەرەنجە، هەرچەندەش لە ڕواڵەتدا بە ئاسایی و گەمژانەش بێتە بەرچاو. ئەوە دەزانین کە خەڵك لە کاتی خوێندنەوەی چیرۆکە ئەڤینداریيەکان، توانای هەڵبژاردن لەدەست دەدەن! فەیلەسوف دەبێ بپرسێت بۆچی شتێکی لەم چەشنە ڕوو ئەدات؟ بۆچی ئەم هەموو فیلم، ڕۆمان و گۆرانییانە هەن کە بەتەواوی لە پێناو چیرۆکە ئەڤینداریيەکان چێ کراون؟ دەبێ شتێکی گشتی و هەمەکی لەبارەی خۆشەویستی بوونی هەبێت کە پەیوەندی و سەرەنجی خوێنەران یان بیسەرانێکی ئاوا مەزن بۆ ئەم چیرۆکانە ڕابکیشێت. ئەوەی گشتییە ئەوەیە کە خۆشەویستی ئەزموونێکی تازەیە لەبارەی هەقیقەتێکی نەگوتراو؛ ئەزموونێك لە چوارچێوەی «دوو»ـبوون نەك «یەك»ـبوون. بەو مانایەی کە دەتوانین دنیا جگە لە ڕێگەی هوشیاری کەسیی ئەزموون بکەین و ڕووبەرووی ببینەوە: هەر خۆشەویستییەك گەواهییەکی تازەیە بۆ ئەم بانگەشەیە و بەم هۆیەیە کە حەزم لێییە بکەومە داوی خۆشەویستی؛ بەو چەشنەی کە قەدیس ئۆگۆستین

باسی دەکات، ئێمە حەزمان لێیە بکەوینە داوی خۆشەویستییەوە، لەلایەکی تر، هەروەها حەزمان لێیە ئەوانیتریش بکەونە داوی خۆشەویستیمانەوە: بێگومان بەو هۆیەی کە ڕاستییەکانمان خۆش ئەوێت و ئەمەش مانا بە فەلسەفە ئەدات: خەڵك ڕاستییەکانیان خۆش ئەوێت، تەنانەت ئەگەر خۆشیان نەزانن کە خۆشیان دەوێت.

**پ: وادەردەکەوێ کە پێویستە لەم هەقیقەتە بدوێین و، لەو خۆشەویستییە بدوێیت کە «ڕادەگەیەنرێت». بەگوێرەی بۆچوونەکانت و بەگوێرەی پێویست، ڕاگەیاندنی خۆشەویستی یەکێکە لە قۆناغەکانی خۆشەویستی. بۆچی دەربڕین و ئاشکرابوون بۆ خۆشەویستی هێندە چارەنووسسازە؟**

**ئالان بادیۆ**: چونکە ئەم ڕاگەیاندنە لە بونیادی خودی ڕووداوەکەوە هەڵدەهێنجێنرێ. سەرەتا، یەکتربینینێك ئەزموون دەکەیت. باسی ئەوەم کرد کە چۆن خۆشەویستی بە خەسڵەتێکی تەواو ڕێکەوتی، دیار و خۆرسکی یەکتربینین دەستپێدەکات. ئەمانە بەڕاستی گەمەکانی خۆشەویستی و شانسن؛ و حەتمیشن. ئەوانە وێرای پروپاگەندەی زۆر و زەبەنداو پتر لەو سنوورەی

کە ئاماژەم پێکرد، بەردەوام بوونیان هەیە، بەڵام شانس دەبێ لە ساتەوەختێکی دیاریکراودا ڕام بکرێت و ببێتە پرۆسەیەك کە دەتوانێ بەردەوام بێت. ئەمە پرسێکی زۆر دژوار و تاڕادەیەك میتافیزیکییە: چۆن ئەشێ ئەوەی لە سەرەتادا شانسێکی پەتییە ببێتە خاڵی پشەئەستووریی بونیادی هەقیقەت؟ چۆن ئەشێ ئەو شتەی کە لە بنەرەتدا شایەنی پێشبینینەکردنە و وابەرچاو دەکەوێ بە کەموکوڕی کۆنترۆڵنەکراو و چاوەڕواننەکراوی بوون گرێ بدرێت، ببێتە مانای ڕووتی ژیانی دوو مرۆڤ کە یەکتریان بینیوە و بوونەتە کەپڵ و وێڕای جیاوازی تێڕوانینەکانیان، لە ئەزموونی بەربڵاوی لەدایکبوونەوەی بەردەوامی جیهان دەرگیر بن. چۆن لە دیدارێکی پەتی، بە پارادۆکسی تاکە جیهانێك کە تێیدا پەر لەسەر «دوو»ـبوون هەڵدەماڵێت، دەگەیت؟ ئەمە نهێنییەکی تەواوە؛ و ئەوەی بەراستی گومانگەرایی بەرامبەر خۆشەویستی پەخشی دەکاتەوە هەر ئەمەیە. دەتەوێ بڵێیت: بۆچی لە چوارچێوەی واقیعەتێکی تەواو گاڵتەجاری پشتئەستوور بەمەی کە فلان کەس لەگەڵ هاوکارە ژنەکەی یان پیاوەکەیدا یەکتریان بینیوە، باس لە هەقیقەتێکی گەورە بکەین؟ ئەمە ڕێك هەر ئەو شتەیە کە دەبێ پێداگیری لەسەر

بکەینەوە: کردەیەکی بەرواڵەت نەشیاو، بەڵام لەو جۆرەی کە لە ژیان و لە پێودانگی بچووکدا بە ڕووداوێکی ڕادیکاڵ لە قەڵەم دەدرێت، و پێداگری لەسەر ئەو ڕەوتە دەکرد و ئارامی لەسەر دەگرت هەڵگری مانایەکی گشتییە.
وێڕای ئەوەش، ئەمە ڕاستە کە «شانس دەبێ ڕام بکرێت» بێ هۆی نییە مالارمێ گوتویەتی: «شانس سەرەنجام ڕام دەکرێت». ئەو ئەمە لەمەڕ شیعر دەڵێت، نەك لەمەڕ خۆشەویستی، بەڵام قسەکەی ئەو ئەشێ لەمەڕ خۆشەویستی و ڕاگەیاندنی خۆشەویستیش، وێڕای هەبوونی دژواریگەلێکی تاقەتپروکێن و جۆرە هەمەچەشنەکانی غەم و بێتاقەتی کە هێناویەتییە کایەوە، بەتەواوی هەر ڕاست بێت. هەندێ کات نزیکایەتی نێوان شیعرەکان و ڕاگەیاندنەکانی خۆشەویستی بەشدارن کە بە خودی زمانەوە وابەستەن. پرسی باسکردنی ئەو قسەیە کە ئەشێ بەرهەم و ئەنجامەکانی تاڕادەیەك بێکۆتا بن. ئەوەی شیعر بەرەو پێش دەبات هەر ئارەزووە. سادەترین وشەکان بە توندییەکی تاڕادەیەك ناجێگیر دەبنە بەرهەمهێنەر. ڕاگەیاندنی خۆشەویستی ڕێگایەکە لە ڕووداوی یەکتربینین، بەمەبەستی دەستتێوەردان بۆ بیناکردنی هەقیقەت. چییەتی ڕێکەوتی و شانس ئامێزی

یەکتربینین، بەئارامی و پلە بە پلە بە قبوڵکردنی جۆرێك دەستپێك شێوەی دەگۆڕێت و زۆرجار ئەوەی لە یەکتربینین دەستپێدەکات ماوەیەکی درێژ دەکێشێ و بەو چەشنەی لە ئەزموون و تازەیی دنیادا لێوریژ دەبێت کە بە نیگایەك بۆ ڕابردوو، هاوشێوەی ئەوەی لە سەرەتادا بەرچاو دەکەوت، ئیدی نە ڕێکەوتی و ڕێکەوتنی کە تاراددەیەك بە جۆرێك پێویستی دەردەکەوێ. شانس بەم چەشنە ڕام دەکرێت. پێشهاتی ڕەها و بێ کۆت و مەرجی یەکتربینین لەگەڵ ئەو کەسەی کە نایناسین، سەرەنجام ڕواڵەتی چارەنووس بە خۆیەوە دەگرێت. ڕاگەیاندنی خۆشەویستی هێمای تێپەرینە لە شانسەوە بۆ چارەنووس و بەم هۆیەیە کە زۆر پڕ مەترسی ترە و بە سەختی لە ژێر فشار جۆرێك لە ترسی سەکۆی شانۆدایە. هەندێ کات، ڕاگەیاندنی خۆشەویستی تەنیا بۆ یەك جار نییە؛ ڕاگەیاندنی خۆشەویستی دەتوانێ دوورودرێژ و تێروتەسل و بەردەوام و ئاڵۆز بێت؛ دەتوانێ جار دوای جار دەربکەوێ و تەنانەت هێندە درێژە بکێشێ کە دووبارە و سەرلەنوێ دەربکەوێتەوە. شانس لە هەمان ئەو ساتەوەختە ڕام دەکرێت کە بە خۆت دەڵێیت: دەبێ من بە لایەنی بەرامبەر، لەبارەی ڕوودان، لەبارەی یەکترینین و ڕووداوەکان بدوێم. من

ئەو شتەی کە پاپەند و پەیوەستم بە هاتنی کرد، لانیکەم لە دیدی خۆم، بەو دەڵێیت؛ لە گوتەیەکدا: خۆشمدەوێی.
لەو کاتەی کە دەڵێی خۆشمدەوێی جۆرێ فێڵ نییە، کەواتە چییە؟ چ شتێك لەو کاتەیەدا دەگوترێت؟ گوتنی «خۆشمدەوێی» هەرگیز ئاسان نییە. بەشێوەیەکی ئاسایی ئاوا دەردەکەوێ کە ئەم ڕستە بچووکە بەتەواوی بێ مانا و گاڵتەجارانەیە. هەندێ کات تاکەکان حەز دەکەن سوود لە ڕستەی شاعیرەکان وەربگرن، بەڵام ئەوەی ئەوان بەردەوام دەیڵێن ئەمەیە کە: هەرکات شانس پەتی بوو دەبێ شتێکی تر دەربکەین. پێموایە تا شتێك بکەمە دەرەوە کە ئارام دەگرێت، ئەو شتەی کە پتەو دەبێت، شتێك لە جۆری پەیمان و وەفادارییە. لێرەوەیە من لە لێکدانەوە فەلسەفییەکانی خۆم وشەی وەفاداری، بەدەر لە ناوەرۆکە ئاساییەکەی، بەکاردەهێنم. وەفاداری ڕێك بەمانای تیپەڕێن لە یەکتربینینی ڕێکەوت و شانس ئامێز بۆ جۆرێك بیناکردنی پتەو و بەهێز، بەو چەشنەی کە پێویستە.

**پ: لەم کۆنتێکستەدا، پێمخۆشە بەشێك لە کتێبی *نامەیەکی بۆ دی* «Andre Gorz, Letter to D»، بەرهەمی**

زۆر جوانیی ئەندرێ گۆرتس بگوازمەوە. کتێبەکە لەبارەی دەرخستنی خۆشەویستیی ئەم فەیلەسوفەیە بۆ هاوسەرەکەی بەناوی دوورین و گێڕانەوەی ئەو خۆشەویستییەیە کە بێ پەردە بڵێین، بۆ هەمیشە درێژەی کێشاوە. نامەکە بەم چەشنە دەست پێ دەکات: «بەم زوانە تەمەنت دەبێتە هەشتا و دوو ساڵ. شەش سانتیمەتر باڵات کورت بۆتەوە، هێشتا کێشت چل و پێنج کیلۆیە و، وەك هەمیشە جوان و، شۆخ و شەنگ و ویستراوی. ئێستا بۆتە پەنجا و هەشت ساڵ پێکەوە دەژێین و لە جاران زیاتر خۆشمدەوێی. دیسانەوە هەست بە بۆشایی و بەتاڵییەکی وێرانکەر لە دەفەی سینگم دەکەم کە تەنیا بە گەرمایی جەستەت ئەو بۆشاییە پڕ دەبێتەوە.» چۆن لە وەفاداری دەڕوانیت و چ مانایەکی بۆ دادەتاشی؟

**ئالان بادیۆ:** ئایا مانای وەفاداری زۆر بەربڵاوتر نییە لەو پەیمانە سادەیەی نەخەوتن لەگەڵ کەسی تر؟ ئایا وەفاداری لەڕاستیدا ئەوە ناخاتە ڕوو کە وتنی یەکەم «خۆشمدەوێی» ئەو پەیمانەیە کە پاپەندی هیچ چەشنە بەپیرۆزکردنێکی تایبەت نییە؟ پەیمانێك بۆ بیناکردنی شتێك کە بە مەبەستی ڕزگارکردنی یەکتربینینە

ڕێکەوتبوونەکەی درێژەی دەبێت. مالارمێ شیعر وەك «ئەو شانسەی کە وشە بە وشە دەستبالاّ دەبێت» دەبینێت. وەفاداری لە خۆشەویستییدا ئاماژەیە بۆ ئەم سەرکەوتنە گەورەیە. ڕیکەوتیبوونی یەکتربینین ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئیدی لە ڕێگەی ئەوەی ئارام دەگرێت و لە ڕێگەی لەدایکبوونی جیهانێکی تازە، سەردەکەوێت. لەبەرچی زۆرجار مرۆڤەکان دەڵێن: بەردەوام خۆشمدەوێی؟ هەڵبەتە ئەگەر ئەمە ڕاگەیاندنی جۆرێك فێڵ نەبێت. بەدڵنیاییەوە ئاکارخوازان بە دەربڕینی ئەوەی کە ڕستەیەکی لەم چەشنە لەڕاستیدا هەرگیز ڕاست نییە، و ڕامی دەکەن. سەرەتا گوتنی ئەوەی کە ئەم ڕستەیە هەرگیز ڕاست نییە، دروست نییە. کەسانێك هەن بەردەوام و زۆر زیاتر لەوەی ئەشێ بیری لێبکەیتەوە یان باسی بکەیت، یەکتریان خۆشدەوێت.

هەموو کەسێك ئەوە دەزانێت کە بڕیاری کۆتایهێنان بە خۆشەویستییەکی وەها، بەتایبەت بە چەشنێکی یەکلایەنە، بەردەوام کارەساتە، هەر چەندەش بەڵگەکانی پشتگیریکردنی ئەم بڕیارە بالاّش بن. تەنیا یەکجار بەدرێژایی ژیانم وازم لە خۆشەویستی هێناوە و ئەوەش خۆشەویستی یەکەمم بوو، پاش ئەوە، هێدی هێدی

تێگەیشتم هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ئەو خۆشەویستییە، یەکەم هەنگاونانم بە هەڵە بووە و زۆر زووش لەو ڕاستییە تێگەیشتم، بەڵام بە توندییەکی تایبەتی و هاوشان بە هەستی پێویستبوون؛ واتە ئەو کاتەی کە مەرگی ئەزیزێکم نزیك دەبۆوە. پاش ئەوە هەرگیز وازم لە خۆشەویستی نەهێناوە. وێڕای هەبوونی تەواوی ڕووداو، و هەستە ناخۆشەکانی دڵ و ئەو گومانانەی کە تێمپەڕاندووە، ئیدی هەرگیز لە خۆشەویستی دانەبڕاوم و بەدروستی و بە پشتبەستن بە ڕاستی دڵنیام ئەو ژنانەی کە خۆشیانم دەوێ بۆ هەمیشە خۆشمدەوێن. لەم ڕووەوە، من بۆ وەستان لەسەر ئەوەی کە تانەی گومانگەراکان دوورە لە ڕاستییەوە، چەندان بەڵگەی کەسییم هەیە و پاشان ئەگەر «خۆشمدەوێی» هەمیشە و لە زۆربەی بوارەکاندا جارچی «خۆشم دەوێی» بێت، لە بنەڕەتدا، شانس لە چوارچێوەی نەمرییدا گیر دەخوات. ئێمە نابێت لە وشەکان بترسین. گیرخواردن و سنوردارکردنی شانس، پێشبینییەکی نەمرە و هەر خۆشەویستییەك تاڕادەیەك نەمریی دەخاتە ڕوو: ئەمە لە ڕاگەیاندندا گونجاوە...

بەم چەشنە، پرسەکە بریتییە لە جێگیرکردنی ئەم جاویدانییە لە چوارچێوەی کاتدا، چونکە لە بنەڕەتدا خۆشەویستی جۆرێکە لە مانفێستی نەمریی کە لە دوو

تویێی کاتدا بە باشترین شێوە بەدیهاتووە و دێتە کایەوە: ئەو نەمرییەی کە لە کاتدا گرفتار دەبێت. لە کۆتاییدا دەبێت بڵێم کە گومانگەرایان دەمانهێننە پێکەنین، لەبەرئەوەی ئەگەر کەسێك هەوڵ بدات بۆ ئەوەی واز لە خۆشەویستی و بڕوابوون پێی بێنێت، کارەساتێکی واقیعی و زەینی دەردەکەوێ و هەمووان ئەمە دەزانن. دەتوانین بڵێین پاش ئەوە، ژیان زۆر خاکیی دەبێت. بەم چەشنە، خۆشەویستی لە ڕووی زەینییەوە هەر بەهێز دەبێت: یەکێك لە ئەزموونە دەگمەنەکان کە بە گوێرەی شانس بەدیهاتووە لە ساتەوەختێکدا، دەست لە ڕاگەیاندنی جاویدانی وەردەدەی. هەمیشە ئەو وشەیەی کە بو ڕاگەیاندنی نەمریی بەکار دەهێنرێت. لەبەرئەوەی نازانیت «هەمیشە» بە چ مانایەکە یان بۆ چەند ماوە درێژە دەکێشێت. «هەمیشە» واتە «بەشێوەی ئەبەدی». «هەمیشە» ئەو پەیمانەیە لە چوارچێوەی کاتدا، چونکە تەنیا کلۆدڵ پێیوایە خۆشەویستی لەو دیو کات و لە جیهانی پرسەیروسەمەرەی دوای مەرگ ئارام دەگرێت، بەڵام ئەو خۆشەویستییەی کە جەوهەر و زاتیی وەفادارە، هەڵبەت لەو مانایەی کە من بو وەفاداری دامناوە، ئەوە دەسەلمێنێت کە نەمریی چۆن دەتوانێت لە ساتی ژیاندا

درێژە بکێشێت. لە وشەیەکدا، بە خۆشحاڵی و شادمانی. بەڵێ، خوشحاڵیی لە خۆشەویستییدا گەواهییە لەسەر ئەوەی کە کات توانای وێکهاتنەوەی لەگەڵ نەمرییدا هەیە و تۆش دەتوانیت گەواهی و شایەتێکی تر لە هەست و سۆز و ئارەزووی سیاسیی کاتی بەشداریکردن لە کردەیەکی شۆڕشگێری، حەز و ئەو چێژەی کە لە بینینی بەرهەمی هونەری بەدەست دێت و ئەزموونی شادمانی و سەرمەستی وەسفنەکراو لە هەوڵی پەیبردنی قووڵی مانای تیورێکی زانستی بدۆزیتەوە.

**پ: با گریمان بکەین خۆشەویستی واتە پێگەیشتنی «دوو» کەس وەك سەکۆی شانۆی «دوو». ئەی لەبارەی منداڵ چۆنە؟ ئاخۆ منداڵ ئەم «سەکۆی شانۆی دووە» نایگۆڕێ و ناشکۆڕێت؟ ئاخۆ ئەو هەر هەمان «یەك» نییە کە دوو ئاشق لە تەنیشت یەکەوە دەبن، لەهەمان کاتدا «سێ»ـیەك دەتوانێت ببێتە هۆی بەردەوامییان و لە هەمان کاتیشدا، ببێتە هۆی لەیەکجیاکردنەوەیان؟**

**ئالان بادیۆ:** ئەم پرسیارە هەم سەرەنجڕاکێشە و هەم قووڵە. جێروم بێناروش *«Jerome Bennaroch»*، یەکێك

لە دۆستانی پسپۆری من و چالاکوانێکی یەهودییە، تاڕادەیەك بۆچوونی من لەبارەی خۆشەویستی پەسەند دەکات. ئەو بەردەوام پێم دەڵێت: بەڵێ خۆشەویستی ئەزموونی «دوو» کەسە، خۆشەویستی ڕاگەیاندن و نەمرییبیانەیە. وێڕای ئەوەش، ئەو ساتەوەختە دەگات کە «دوو» دەبێ تاقیکردنەوەکەی وەك «یەك» تێبپەڕێنێت. وێنەکە هاوکات ڕەمز و واقیعی «یەك»، منداڵە و، ئامانجی هەقیقی خۆشەویستی لە هەبوونی منداڵ وەك دەربڕینی «یەك» دەمێنێتەوە. ئەو پێشنیارانەی کە ئەو دەیخاتە ڕوو لەڕووی ئەزموونی و لە لایەنە هەمەچەشنەکانەوە تووشی قەیرانی دەکەم، بەتایبەت بەم هۆیەی کە پابەندی ڕەتکردنەوەی چییەتی خۆشەویستانەی کەپلە خاوێنکەرەوەکان، هۆمۆسێکسواڵەکانە. ئەوکات لە ئاستێکی قووڵتر پێمگوت: بەڕاستی منداڵ بەشێکە لە فەزای سنووربەندیکراو و پەراوێزخراو لەلایەن خۆشەویستییەوە و، لە خۆیدا وەك لێکدانەوەکانی خۆم تایبەت بە «یەك خاڵ». یەك خاڵ واتە ساتەوەختێك بەتایبەت کە لە دەوروبەری ئەو ڕووداوەدا خۆی دەسەلمێنێت، لەو شوێنەی کە دەبێت بە ڕێگەیەك دووبارە ببێتەوە، بەو چەشنەی کە گوایە بە فۆرمێکی گۆڕدراو و دەستاودەست

دەگەڕێتەوە، بەڵام ئەو فۆرمەی کە وات لێدەکات تاوەکو «سەرلەنوێ ڕایبگەیەنیت». یەك خاڵ لە بنەڕەتدا ئەو کاتە دەگات کە ئاکامەکانی بیناکردنی هەقیقەت چ لە ڕووی سیاسی، خۆشەویستانە، هونەری یان زانستی، هەر لە خۆڕا واتلێدەکات هەڵبژارنێکی ڕادیکاڵانەت هەبێت، گەڕانەوە بۆ ڕابردوو و بۆ سەرەتا، واتە ئەو کاتەی کە ڕووداوەکە پەسەند دەکەیت و ڕایدەگەیەنیت، دەگەڕێیتەوە. جارێکی تر دەبێت بڵێیت: «من ئەم شانسەم هەیە، دەمەوێ و لە ئەستۆی دەگرم.» لە کاتێکدا، لە خۆشەویستی دابیت، زۆرجار دەبێت لە سەرەتاوە، خۆشەویستیتان سەرلەنوێ ڕابگەیەننەوە. تەنانەت دەتوانین بڵێین: دەبێ «ئەوە» لە سەرەتاوە سەرلەنوێ دروست بکەیتەوە و، بە دیدی من، مانای منداڵ، ئارەزوو بۆ هەبوونی منداڵ و لەدایکبوون، جگە لەمە شتێکی تر نییە؛ ئەمەش بەشێك لە پرۆسەی خۆشەویستی پێکدەهێنێ، بەشێوەیەکی ئاشکرا، لە شێوەی دروستکردنی خاڵێکی پشتیوانی بۆ خۆشەویستی. ئەوەش دەزانین کە لەدایکبوون لەو یەکەیەدا موعجیزە و قەیران و ئەزموونێکە بۆ هەموو کەپڵەکان. لەبەرئەوەیە منداڵ «یەکە»، ڕازاندنەوەی «دوو» لە تەك ئەو دەبێتە ناچەرەکی. «دوو» ناتوانێ هاوشێوەی ڕابردوو و پێش

ئەوەی لەم بارەیەوە تووشی کێشە و قەیران بکرێتەوە، درێژە بە ئەزموون و تاقیکردنەوەی یەکتر لە جیهان بدات. بە هیچ شێوەیەك من خەسڵەتی پەراوێزیی خۆشەویستی، یان بە دەربڕینێکی تر، سەربەخۆییەکەی ڕەت ناکەمەوە. چەندان ساتەوەخت، تاقیکردنەوە، وەسوەسە و دەرکەوتە لەئارادان و هەرجارێکیش دەبێ «سەکۆی دوو» لە سەرەتاوە جێبەجێ بکەیت و چەند لێکدانەوەیەك بۆ ڕاگەیاندنێکی تازە بدۆزیتەوە. دوای یەکەمین ڕاگەیاندن، خۆشەویستیش دەبێ «سەرلەنوێ و لە سەرەتاوە بخرێتەوە ڕوو»، بەم هۆیەیە کە خۆشەویستی خاسیەتی قەیرانە ئۆنتۆلۆجییە توندوتیژئامێزەکانی هەیە. وەك ئەو پرۆسانەی کە سەروکارییان لەگەڵ گەڕان بەدوای هەقیقەتدا هەیە. هەندێ کات، لەم گۆشەنیگایەوە لێکچوونێکی بەرچاو لەنێوان سیاسەت و خۆشەویستیشدا هەیە.

**پ: چ پەیوەندییەك لە نێوان خۆشەویستی و سیاسەتدا هەیە؟ ئاخۆ بەم چەشنە نییە کە سیاسەتیش وەك خۆشەویستی سەروکاری لەگەڵ ڕووداو، مانفێست و وەفادارییەکاندا هەیە؟**

**ئالان بادیۆ:** بە دیدی من، سیاسەت جۆرێکە لە شێوەی هەقیقەت، بەڵام شێوەیەك کە سەنتەرەکەی کۆیە. بەو مانایەی کە کردەی سیاسیی هەقیقەت لە ڕووی ئەوەی کۆ توانای بەدەستهێنانی هەیە، ئەزموون دەکات. بۆ نموونە، ئایا ئەتوانێ یەکسانی بە تەواوی هەبێت؟ ئایا ئەتوانێ ئەوەی ناتەبایە یەکپارچە بکات؟ ئایا ئەتوانێ ئەوە قبوڵ بکات کە تەنیا یەك جیهان لە ئارادایە؟ شتانێکی لەم چەشنە. گەوهەری سیاسەت ئەشێ لەم پرسیارەدا بدۆزینەوە: کاتێ کەسەکان لە دەوری یەك کۆدەبنەوە، کاروبارەکان ڕێکدەخەن، بیردەکەنەوە و بڕیار دەدەن، توانای ئەنجامدانی چ کارێکییان هەیە؟ لە خۆشەویستیدا، پرسەکە بریتییە لە زانینی ئەم بابەتەی کە ئایا دوو کەس ئەتوانن جیاوازییەکان بەرێوە بەرن و داهێنان بکەن؛ لە سیاسەتدا، پرسەکە بریتییە لە پەی بردن بەم پرسەی کە

ئایا ژمارەیەك لە خەڵك یان لە ڕاستیدا جەماوەران توانای هێنانەکایەوەی یەکسانیان هەیە؟ ڕێك بەو چەشنەی کە لە ئاستی خۆشەویستییدا ئامانجی بەکۆمەڵایەتیکردنی خرپبوونەوەکان و بەرهەمەکانی خۆشەویستییە، لە ئاستی سیاسەتیش ئامانج لە دەسەڵاتی دەوڵەت چەپاندنی ویست و ئارەزووەکانیەتی. هەر ئەم پەیوەندییە، وروژێنەری نێوان سیاسەت و خۆشەویستیش بوونی هەیە: لە نێوان سیاسەت وەك شێوەیەکی بیرکردنەوەی بەکۆمەڵ و پراکتیك و دەسەڵات وەك ئامرازی بەرێوەبردن و چاودێری لە دەست دەوڵەت، هەر هەمان ئەو پەیوەندییە وروژێنەرە ئامادەیە کە لە نێوان خۆشەویستی وەك جۆرێك داهێنانی سەربزێوی «دوو» و خێزان وەك یەکەیەکی بنەڕەتی خاوەندارێتی و خودسەنتەری.

لە بنەڕەتدا، لەو شێوەیەی کە بە وشەی دەوڵەت یاری بکەیت، دەتوانیت خێزان بە دەوڵەتی خۆشەویستی پێناسە بکەیت. بۆ نموونە، ئەو کاتەی کە لە بزوتنەوەیەکی سیاسیی مەزن بەشداری دەکەیت، لە دوو لایەنەوە ڕووبەرووی فشاری ڕووحی و بارگرژی زۆر پێشبینیکراو دەبیتەوە: لایەنی **یەکەم:** کۆکردنەوەی توانای ئەنجامدانی چ کارگەلێکت هەیە؟ **دووەم:** دەسەڵات و هەڵبژاردنی دەوڵەت. ئەنجامەکەی بریتییە لەوەی کە

دەوڵەت تاڕادەیەك بەردەوام لە دۆخی دڵساردکردنی هیوای سیاسییە. ئایا هەنوکە دەبێت ئەوە پشتڕاست بکەینەوە کە خێزان بەردەوام لە دۆخی بێ‌هیواکردنی خۆشەویستییە؟ پرسیارکردنێکی لەم چەشنە زۆر ڕوونە. لە دیدی من، ئەم پرسارە قۆناغ بە قۆناغ و بڕیار بە بڕیار کاریگەری لەسەر خۆشەویستی دادەنێت. قۆناغگەلێکی وەك قۆناغی نوێبوونەوەی سێکسی، منداڵەکان، کار، هاورێیان، شەوانی دەرەوەی ماڵ، پشووەکان و ..هتد بوونیان هەیە و سنوردارکردنی هەر هەموویان بۆ پانتایی ئەرك و بەرپرسیارێتییەکانی ڕاگەیاندنی خۆشەویستی هەرگیز شایەنی پەی پێ بردن نییە. بەشێوەیەکی هاوشێوە، لە سیاسەتدا پرسگەلی وەك دەسەڵاتی دەوڵەت، یاسا، سنورەکان و پۆلیس لە ئازادان و پاراستنیان لە کۆنتێکستی چوارچێوەیەکی سیاسیی کراوە، شۆڕشگێڕ و یەکسانیخوازانەدا هەرگیز کارێکی ئاسان نییە.

لە هەردوو بوارەکەدا، سەروکارمان لەگەڵ چەند پرۆسەیەکی قۆناغ بە قۆناغدا هەیە و ئەم پرۆسانە بنەمای ئەرگومێنتەکەم لەبەرامبەر هاوڕێ ئاینییەکەم دروست دەکات. ئەم ئەزموونە، لەگەڵ ئامانجی دوایی تێکەڵ و پێکەڵ نەکرێت. پێدەچێت سیاسەت هەرگیز نەتوانێ بێ دەوڵەت بەدی بێت، بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە کە دوا

ئامانجی دەسەڵاتە. ئامانجی سیاسەت ئەوەیە کە ببینیت کۆکردنەوەی توانای ئەنجامدانی چ کارگەلێکی هەیە، نەك دەسەڵات بە تەنیایی. بەشێوەیەکی هاوشێوە، لە خۆشەویستییدا ئامانجی ئەزموونی سات لە دوای ساتی جیهانە لە گۆشەنیگای جیاوازییەوە، نەك بەرهەمهێنانی دڵنیایی لە بەرهەمهێنانەوەی جۆرەکاندا. ئاکارگەراییەکی گومانخواز لە خێزان ئاراستەیەکی ڕەشبینی خۆی دەدۆزێتەوە: گەواهیدان بەوەی کە لە کۆتاییدا، خۆشەویستی فێڵی جۆری مرۆڤ بۆ دەستەبەرکردنی مانەوە و ڕێگەخۆشکردنی کۆمەڵگا بۆ دەستەبەرکردنی گواستنەوەی بۆماوەیی ماف و سەرپشکەکان، بەڵام من دادوەرییەکی ئاوا پەسەند ناکەم. هەروەها دیدگای هاورێکەم پشت ئەستوور بەوەی کە وەدیهاتن بە شکۆی دەسەڵاتی «دوو» لەلایەن خۆشەویستییەوە، ناچار بە چۆکدادان لەبەرامبەر پادشایی «یەك» دەبێت.

**پ: لەم شێوەیەدا، بۆچی ناتوانیت جۆرێك لە «سیاسەتی خۆشەویستی» لە مێشکدا بەرجەستە بکەیت، ڕێك بەو چەشنەی کە ژاك درێدا «سیاسەتی هاورێیەتی» دارشت؟**

**ئالان بادیۆ:** پێموانییە بتوانرێ خۆشەویستی و سیاسەت تێکەڵاو بکرێت. «سیاسەتی خۆشەویستی»، بەدیدی

من، دەستەواژەیەکی بێ مانایە. بۆیە پێموایە ئەو کاتەی ئەڵێیت «یەکترتان خۆشبوێ»، گوتەکەتان ڕەنگ و بۆی جۆرێك لە ئاکار دەبەخشێت، بەڵام سیاسەت، هەرگیز. لە سیاسەتدا، ڕووبەرووی کەسانێك دەبینەوە کە خۆشمان ناوێن... ئەمەش شایەنی ڕەتکردەوە نییە. ناتوانین وا لە خۆمان بکەین خۆشیانمان بوێت.

**پ: کەواتە بە پێچەوانەی خۆشەویستی، سیاسەت بەتەواوی بەدەوری ڕووبەرووبونەوەی نێوان دوژمنان دەخولێتەوە؟**

**ئالان بادیۆ:** زۆر باشە، تەماشاکە، لە خۆشەویستییدا، جیاوازییەکی ڕەها لە نێوان دوو کەسدا هەیە، واتە یەکێك لە گەورەترین ئەو جیاوازییانەی کە ئەشێ وێنای بکەیت و بە گریمانەی بێ سنور و ڕادەی گەمارۆدانی ئەم جیاوازییە، هەمدیس ڕووبەرووبونەوە و ڕاگەیاندنی خۆشەویستی و وەفاداری ئەتوانن ببنە بونەوەرێکی دروستکەر. زەحمەتە شتێکی لەم چەشنە لە سیاسەتدا، لە ڕووی ململانێیە سەرەکییەکان و بە ڕەچاوکردنی ئەوەی بەڕاستی سەروکاری لەگەڵ دوژمنانی هەڵبژێردراو و دیاریکراودا هەیە دەربکەوێت. بابەتێکی سەنتەری لە بیرکردنەوەی سیاسییدا پرسی دوژمنانە و، ئەمرۆ سەرقاڵبوون پێی

کارێکی زۆر دژوارە. بەشێك لەم دژوارییە، بە هۆی ئەو چوارچێوە دیموکراسیەوەیە کە کەسەکان لە ڕێگەیەوە کار دەکەن. پرسە سەرەکییەکە ئەوەیە کە ئاخۆ دوژمنان بوونیان هەیە؟ مەبەستم لە دوژمنانی واقیعییە. دوژمنی واقیعی ئەو کەسە نییە کە بەهۆی ئەوەی زۆربەی کەسەکان دەنگی پێنادەن و لە چوونە سەر دەسەڵات ئەویان پەسەند نییە، واتە ئەو کەسەی لە بینینی ئەو لە لوتکەی دەوڵەت ئازار دەچێژێت، لەبەرئەوەی بەرەبەرەکانێکەرەکەی ئەو زاڵ دەکات و بۆ ماوەی پێنج ساڵ، دەساڵ یان زیاتر چاوەڕوان دەبیت تا نۆبەتان بگات و شانسی خۆت دووبارە تاقی بکەیتەوە. دوژمن شتێکی ترە: ئەو کەسەی نەتوانیت زاڵی بکەیت کە ئەو لەمەڕ شتێك بڕیار بدات، کاریگەری بەسەر خۆیەوە دەبێت. بەم چەشنە، ئاخۆ دوژمنانی واقیعی هەن یان نا؟ دەبێ ئەمە خاڵی دەستپێکردنمان بێت.

ئەم پرسە لە سیاسەتدا بایەخێکی یەکجار زۆری هەیە، پرسێك کە هەر زوو دەیخەینە لاوە و فەرامۆشی دەکەین. پرسی دوژمن بەتەواوی بەرامبەر بە بابەتی خۆشەویستی نامۆیە. ئەشێ لە خۆشەویستییدا ڕووبەرووی چەند بەربەستێك ببیتەوە و دووچاری کارەساتگەلی ناوەکی

ببیت، بەڵام بە ڕاستی هیچ دوژمنێك لە ئارادا نییە. بە دڵنیاییەوە دەڵێیت: بەربەرەکانێکاری من چۆنە؟ ئەو کەسەی کە خۆشەویستەکەم بەسەرمییدا زاڵ دەکات، کێیە؟ زۆر باشە، ئەم گاتیگۆریە بەتەواوی و بە ڕەهایی جیاوازە. لە سیاسەتدا، ململانێ دژی دوژمن بنچینەی کردەیە. دوژمن بەشێك لە زات و گەوهەری سیاسەت پێکدەهێنێ. سیاسەتی ڕاستەقینە دوژمنی واقیعی خۆی دەناسێت، بەڵام بەربەرەکانێکار بەڕەهایی لەدەرەوەی پێناسەی خۆشەویستی دەمێنێتەوە و شوێنێکی تیایدا نییە. لەم بارەیەوە، من بە قووڵی و بە سەختی لەگەڵ تەواوی ئەو کەسانە نەیارم کە پێیانوایە چاوچنۆکی یەکێکە لە توخمە بیناکەرەکانی خۆشەویستی. ناسراوترین نوێنەری ئەم شێوە بیرکردنەوەیە *پرۆستە* کە لە دیدی ئەو، چاوچنۆکی ناواخنی پڕهەست و واقعی و شەیتانی سوبێکتی خۆشەویستانەیە. بە بڕوای من، ئەمە خوێندنەوەیەکی ترە لە بۆچوونی ئاکارگەرایانی گومانخواز «**The Sceptical Moralists**».

چاوچنۆکی ئەو مشەخۆرە بیناکراوەیە کە لە خۆشەویستییەوە وزە وەردەگرێت و هەرگیز یارمەتی پێناسەکردنی نادات. ئاخۆ هەر خۆشەویستییەك بۆ ئەوەی ڕابگەیەنرێ و دەست پێ بکات، دەبێ بەربەرەکانێکاری

دەرەکی بناسێت؟ بە هیچ شێوەیەك! بە پێچەوانەوە: دژوارییە ناوەکییەکانی نەوە و ململانێیە ناوەکییەکانی دوو کەس ئەشێ لە کەسێکی تردا، واتە بەربەرەکانێکارێکی واقیعی یان خەیاڵی ڕەنگ بدەنەوە. دژوارییە شاراوەکانی خۆشەویستی بە هۆی هەبوونی دوژمنێکی ناسراوەوە نییە. ئەوان لە ناخی پرۆسەکەوە دەردەکەون: شانۆی بیناکەری جیاوازی. هیچ بەربەرەکانێکارێك هێندەی خودخوازی، دوژمنی خۆشەویستی نییە. ئەشێ بڵێین: دوژمنی سەرەکی خۆشەویستی من، ئەو کەسەی کە دەبێ بەسەریدا زاڵبم، ئەویتر نییە، خۆمم؛ ئەو «خود»ـەی کە شوناسەکەی بە جیاوازی زاڵ دەکات؛ ئەو «خود»ـەی کە پێی باشە جیهانەکەی بەسەر جیهانی نۆژەنکراوە زاڵ بکات، ئەویش بە تێپەڕین لە فلتەری جیاوازی.

**پ: ئەشێ خۆشەویستی ببێتە جەنگیش...**

**ئالان بادیۆ:** دەبێ ئەوەت وەبیر بێنمەوە کە هاوشێوەی زۆرێك لە پرۆسەکانی دۆزینەوەی هەقیقەت، پرۆسەی خۆشەویستی بەردەوام ئاشتییانە نییە و ئەشێ وتوێژی زەبروزەنگاوی، ئازاری واقیعی و جیابوونەوەش بەدوای خۆییدا بێنێت کە ڕەنگە بەسەریاندا زاڵ بین و ڕەنگیشە نەتوانین. دەبێت ئەوە بڵێین کە پرۆسەی خۆشەویستی

یەکێکە لە بەئازارترین ئەزموونەکانی هەر کەسێك لە ژیانی سوبێکتییدا. بەم هۆیەیە کە هەندێ لە تاکەکان بەرنامەی پروپاگەندەیی «بیمەی گشتگیر» بڵاو دەکەنەوە. پێشتریش گوێمان لێ بووە کە کەسەکان بە هۆی خۆشەویستییەوە دەمرن. کوشتن و ئەو خۆکوشتانەی کە هۆکار و پاڵنەرییان خۆشەویستی بووە. لە ڕاستییدا، خۆشەویستی لە ئاستی خۆییدا، ئاشتییانەتر لە سیاسەتی شۆڕشگێری نییە. هەقیقەت ئەو شتە نییە کە لە باغی گووڵە سورەکاندا بینا بکرێت، هەرگیز! خۆشەویستی ململانێ و چەند توندوتیژییەکی خۆی هەیە. بەڵام جیاوازییەکە لەوەدایە کە لە سیاسەتدا بەڕاستی ناچارین ڕووبەرووی دوژمنەکانمان ببینەوە، لە کاتێکدا لە خۆشەویستییدا بەشێوەیەکی گشتی سەروکارمان لەگەڵ کارەساتە ناوەکییەکانماندا هەیە کە لەڕاستیدا پێناسەی هیچ دوژمنێك ناکەن، ئەگەر چی هەندێ کات پرسی شوناس لە ڕووی ململانێ لەگەڵ جیاوازی دێنە پێشەوە. دراماکان لە خۆشەویستییدا ئاشکراترین ئەزموونی ململانێی نێوان یەکسانی و جیاوازیین.

**پ: وێڕای ئەوەش، ئاخۆ لە بنەڕەتدا بەیەکەوەبەستانەوەی سیاسەت بە خۆشەویستی، بۆ بەئەخلاقیکردنی (moralizing) سیاسەتی خۆشەویستی کاریکی گونجاوە؟**

**ئالان بادیۆ:** دوو تێگەی سیاسی یان فەلسەفی/سیاسیی هەیە کە ئەشێ لە ئاستێکی فۆرماڵی لەگەڵ دیالێکتیکەکانی خۆشەویستی بەراورد بکرێت. سەرەتا وشەی «کۆمۆنیزم» لەخۆگری ئەم ئایدیایە کە کۆکردنەوەی توانای یەکپارچەکردنی تەواوی جیاوازییە بان-سیاسییەکاندا هەیە. نابێ لە بەشداری خەڵك لە پرۆسەی سیاسی لە چەشنی کۆمۆنیستی بەربەست دابنرێت، ئەوەش بەو هۆیەی کە ئاوا و ئاوان، لێرە لەدایکبوونە یان خەڵکی شوێنێکی ترن، بە فلان زمان دەدوێن، خاوەنی فلان کولتوورن؛ بەو چەشنەی کە ناسنامەکان بۆ خودی خۆی بەربەستی داهێنان و هێنانەکایەوەی خۆشەویستی نین. بەگوێرەی گوتەکەی مارکس، تەنیا جیاوازی سیاسی لەگەڵ دوژمندا کە بەرژەوەندییەکانی لەگەڵت وێك نایەتەوە و جیاوازییەکی لەم چەشنە هیچ هاوکێشەیەك لە پرۆسەی خۆشەویستیدا نییە و پاشان بە وشەی «برایەتی» دەگەین. برایەتی ئاڵۆزترین وشەیە لە نێو هەر سێ وشە دروشمییەکەی پارتی کۆماریخواز. دەتوانین

لەمەڕ وشەی «ئازادی» بدوێین، بەڵام ئەوەش دەزانین کە «ئازادی» چییە و لە چی دەدوێت. دەتوانین پێناسەیەکی تاڕادەیەك ورد لە یەکسانی بخەینە ڕوو، بەڵام ئەی «برایەتی» چ مانایەکی هەیە؟ بێگومان ئەم وشەیە بە پرسی جیاوازییەکان، ئامادەیی هاوبەش و یەکانگیرانەیان لە پرۆسەی سیاسی، وەك سنوورێکی خودی لە ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ دوژمن، پەیوەست دەبێت. وشەی برایەتی ئەو تێگەیەیە کە دەتوانێ لە ژێر چەمکی ئینتەرناسیۆنالیزم «internationalism» دابنرێت، لەبەرئەوەی ئەگەر کۆکردنەوە بەڕاستی بتوانێ یەکسانی قبوڵ بکات و باوەڕی پێی هەبێت، بەو مانایەیە کە ئەتوانێ بەرفراوانترین بیرجاواز و پەرشوبڵاوییەکان یەکپارچە بکات و دەسەڵاتی شوناس بە ڕادەیەکی زۆر سنوردار بکات.

**پ: لە سەرەتای گفتوگۆکانماندا، باسی مەسیحیەتت کرد وەك «ئایینی خۆشەویستی». لە ئێستا بەدواوە با جەخت لەسەر دەرخەرەکانی خۆشەویستی لە ئایدۆلۆژیا مەزنەکان بکەینەوە. لە دیدی تۆدا، مەسیحیەت چۆن توانیویەتی دەسەڵاتی نائاسایی خۆشەویستی ڕام بکات و بیجولێنێت؟**

**ئالان بادیۆ:** بە دیدی من لەم چوارچێوەیەدا یەهودیەت ڕێگاکەی بۆ مەسیحیەت بەتەواوی هەموار کردووە. ئامادەیی

خۆشەویستی لە سەردەمی دێرین زۆر گرینگ و بەرچاوە، هەم لە دیدی ڕەچەتەکان و هەم لەدیدی وەسفکردنەکان. غەزەلی غەزەلەکان کە جۆرێکە لە غەزەلی خۆشەویستی، یەکێکە لە دەسەڵاترین یادەوەری خۆشەویستی کە تا هەنوکە نەنوسراوە، جا مانا ئیلاهییەکیەکەی هەرچی بێت. مەسیحیەت لە خۆیدا وردترین نموونەی سوودوەرگرتن لە حەز و ئارەزووی خۆشەویستی لە ڕێگەی تێگەیشتنێکی باڵا لە گشتێتی و هەمەکییە. مەسیحیەت دەڵێت: لەو شێوەیەی کە یەکترتان خۆشدەوێت، تەواو ئەم گرووپە ئاشقە بەرەو سەرچاوەی مەبەستداری هەر چەشنە خۆشەویستییەك لە خۆیدا ترانسیندنتاڵیی ئیلاهییە، دەڕوات. مەسیحیەت ئەم ئایدیایە دەخاتە ڕوو کە پەسەندکردنی ئەزموونی خۆشەویستی، ئەزموونی ئەویتر و نیگایەکی فراوان کە بە ئەویترەوە پەیوەستە، پشکداربوون لە خۆشەویستییەکی بێ کەموکوڕییە، هەم ئەو خۆشەویستییەی کە قەرزاری خوداوەندین و هەم ئەو خۆشەویستییەی کە خودا پێمانی ئەدات و ئایدیایەکی لەم چەشنە، بێگومان ئاورینگی بلیمەتییە! مەسیحیەت بە جێگیربوونی کڵێساکەی (دەرخەری دەوڵەتەکەی) توانیویەتی ئەم دەسەڵاتە بەدەستبهێنێت؛ ئەو دەسەڵاتەی کە ئەوی دروستکردووە، بۆ نموونە، ئازار و دەرد، نەك

بۆ مانەوەی کەسیی، کە بەناوی بەرژەوەندییە باڵاکانی کۆمەڵ قبوڵی بکات و وەریبگرێت.
مەسیحیەت بە باشی لەوە تێگەیشتووە کە توخمێك لە دەرکەوتنی ڕواڵەتی خۆشەویستی بوونی هەیە کە زەحمەتە بۆ ئەم دەرکەوتنە کورت بکرێتەوە. بە پێچەوانەوە، بێ هیچ سلەمینەوەیەك تا ئاست و پلەی ترانسیندنتاڵ دەیباتە سەرەوە و ڕەگ و ڕیشەی گرفتەکەش هەر لەمەدایە. منیش ئەم توخمە گشتییە لە خۆشەویستی وەك توخمێکی نەمر دەناسێنمەوە، بەڵام مەسیحیەت لەوە سەرکەوتوو بووە بە ڕێگەیەك بەرزی بکاتەوە و دووبارە لەسەر دەسەڵاتێکی باڵا جێگیری بکا. ئەم بەرزبونەوە و دەستاودەستکردنە ئایدیالییەی کە پێشتریش تاڕادەیەك لە ئایدیای خێری ئەفلاتوون ئامادە بوو. ئەمە یەکەمین دەستکاری وریایانەیە لە دەسەڵاتی خۆشەویستی و هەر لەبەر ئەمەیە دەبێ بەرەو زەوی بگەڕێینەوە. بەدیدی من، دەبێ بیسەلمێنین کە خۆشەویستی بەڕاستی دەسەڵاتێکی گەردوونی هەیە، بەڵام ئەو دەرفەتەیە کە بە مەبەستی لەززەتبردن لە ئەزموونی داهێنەرانە، پۆزەتیڤ و ئەرێیانەی جیاوازمان پێ دەبەخشێت. ئەم ئەزموونە، بێگومان ئەزموونی ئەویترە، بەڵام «ئەویتری بەهێز بەسەر هەموو شتێکەوە)، نەك (ئەویتری گەورە)ـی

ترانسیندنتاڵ. له لایەکی تر، ئایینەکان له خۆشەویستی نادوێن، لەبەرئەوەی ئایینەکان وەك سەرچاوەیەکی سۆز و تین له خۆشەویستی دەڕوانن، بەو دۆخە سەبجێکەتیڤەی کە تەنیا دەتوانێ خۆشەویستی دابهێنێت، تاکو ئەو حەز و ئارەزووە بەرەو ئیمان و کڵێسا ئاراستە بکەن و ئەو دۆخە سەبجەکەتیڤیەش بەرەو قبوڵکردنی سەرووەری خوداوەند ڕابماڵن. ئەنجامە سەرەکییەکەشی بریتییە لەوەی کە مەسیحیەت خۆشەویستی بێگەرد، ڕێزدارانە و زاهیدانە بە بەدیلی خۆشەویستی شەڕانی دادەنێت کە من ستایشی دەکەم، خۆشەویستی شەڕانی کە لە دیدی من، هەر هەمان ئەو داهێنانە زەمینییەی جیهانی نوێیە کە بەگوێرەی جیاوازی لەدایکبووە و، داهێنانیش ئەو شادمانییەیە کە قۆناغ دوای قۆناغ بەدەست دێت. له دیدی من، خۆشەویستی بە چۆکداهاتوو هەرگیز خۆشەویستی نییە، تەنانەت ئەگەر هەندێ کاتیش خۆشەویستی حەز و ئارەزووی خۆشەویستییانەشمان تیا بوروژێنێت کە وامان لێدەکات لەسەر ویستی خۆشەویستەکەمان بمێنینەوە.

**پ: پێشتر لەگەڵ ئەنتوان ڤیتز کارتان کردووە، بەتایبەت ئەو کاتەی سەرقاڵی ئامادەکردنی بەرهەمە بەناوبانگەکەی خۆت بوویت واتە (The Satin slipper)ـی پۆل کلاودێل.**

**ئاخۆ تێڕامان لەبارەی خۆشەویستی لەلای نووسەری کتێبی پشووی نیوەڕۆ، کە هەر هەمووی باسکردنە لە مەسیحییەت، هیچ گوتەیەکت بۆ خەڵکی ئەمرۆ هەیە لە کاتێکدا کە زۆربەیان مەسیحی نین؟**

**ئالان بادیۆ:** کلاودێل شانۆنامەنووسێکی مەزنە لە بواری خۆشەویستی. (**The Satin slipper**) و ***پشووی نیوەڕۆ*** بەتەواوی تایبەتن بەم ناوەرۆکەوە، بەڵام چ شتێك لە کلاودێلدا هەیە کە بتوانێ سەرەنجمان بەرەو لای خۆی ڕابکێشێت، هەنوکە شتانێکی وەك یەکێتی ڕوحانی پیرۆزکراوەکان، پاداشت بۆ کارە باشەکان و ڕزگاربوون لە ژیانی دوای مردن ڕاستەوخۆ نامانورژێنێت؟ تەنیا دەتوانم بیر لەو ڕستەیە بکەمەوە لە کۆتایی کتێبی ***پشووی نیوەڕۆدا*** هاتووە: «زۆر دوور لە یەك، ئەگەر چی هیچ کات دەست لە پشتبەستن بە هەوڵەکانی یەکتر ناکێشینەوە، بەڵام ئایا ڕووحەکان لە هەوڵەکانمان ناچارمان دەکەن جێگیر بین؟» کلاودێل بەشێوەیەکی تایبەت بەرامبەر بەم دۆزەی کە خۆشەویستی هەقیقی بەردەوام لەسەر بێتوانایی زاڵ دەبێت هەستیارە: «دوور لە یەك، ئەگەر چی هیچ کات دەست لە پشتبەستن بە هەوڵەکانی یەکتر ناکێشینەوە...» بە مانای وردی وشەکە، خۆشەویستی جۆرێك لە توانایی نییە، بەڵکو زاڵبوونە بەسەر ئەو شتەی

که هۆکارێك نییه بۆ بوونی و هەرگیز وەك شتێکی گونجاو بۆت ناخرێته ڕوو. ئەمەش هۆکارێکی تره بۆ ئەوەی که پروپاگەنده بێ بنەماکانی پێگەی دۆزینەوەی هاورێ له ئینتەرنێتدا کارێکی هەڵەیه. ئەم پروپاگەندانه پشت بەم گریمانەیه دەبەستن که وا خەیاڵ دەکەیت تەواوی توانای هەیی بخەیته بەر پێداچوونەوە و باشترینیان بەمەبەستی سوودوەرگرتن له خۆشەویستی هەڵبژێریت، بەڵام ژیان بەم چەشنه نییه! ژیان هاوشێوەی ئەو چیرۆکانه نییه که تێیدا ئاشقەکان یەك له دوای یەکتر دەگەن. لێرەوەیه تواناییەکه خۆی دەسەپێنێت و خۆشەویستی دەست پێ دەکات، و کڵاودێل به هۆی ڕوونکردنەوەی ناوەرۆکی ژنی هەرەشەلێکراو، شاعیری گەوره مەحاڵه. له دیدی کڵاودێل، زارەکان هەمیشه کەمێك قورس دەبن، چونکه ئەوەی نەکردەیه ڕێژەییه، ئەمەش به هۆی زەمینیبوونی. من پێموایه کڵاودێل لەبڕی یەك «سەکۆی دوو»، دوو «سەکۆی دووی» هەیه. یەکەمین سەکۆی ئەزموونی نەکردەیی خۆشەویستی لەسەر زەویه و دووەمین سەکۆی بریتییه له دوو که له دنیای ئیمان ئاشتی ڕادەگەیەنن. پەیڕەوکردنی میکانیزمه شاعیرانەییه شکۆمەندەکان که کڵاودێل بەکاری دەهێنێت تاوەکو سوود له توانای سەکۆی یەك له ڕووی هێزبەخشین به سەکۆی دوو وەربگرێت،

جادووگەرانەیە. لە مەسیحیەتیشدا هەر بەم جۆرەیە. مەسیحیەت خۆشەویستی خۆی بە سوودوەرگرتن لە دەسەڵاتی زەمینی بەم چەشنە دەناسێنێت: (بەڵێ، هەندێ لە شتەکان هێندەش بەهێز بن هەر نەکردەن، بەڵام جێگای نیگەرانی نییە، لەبەرئەوەی ئەوەی لێرە لەم جیهانە کردەنییە، لە جیهانی دوای مردن بەم چەشنە نییە.) دروشمێکی زۆر سەرەتایی بەڵام زۆر کاریگەرە.

**پ: ئەمە ئارەزووی گەڕاندنەوەی خۆشەویستییە بۆ سەر زەوی و گواستنەوەیەتی لە پلەی ترانسێندنتاڵەوە بۆ نەمریی و زیندوێتی کۆمۆنیزمی مێژوویی. چۆن ئەتوانین بە بەکارهێنانی دووبارەی گریمانەی کۆمۆنیزم، خۆشەویستی سەرلەنوێ دابهێنینەوە؟**

**ئالان بادیۆ:** کەمێك پێش ئێستا ئاماژەم بەوە کرد کە لەبارەی بەکارهێنانی سیاسی وشەی خۆشەویستی چۆن بیر دەکەمەوە و، ئەوانەش ڕێك بە ئەندازەی بەکارهێنانە ئایینییەکانی ئەم وشەیە بە لاڕێدا براون. وێڕای ئەوەش، لێرەشەوە بەشێوەیەکی تەواو سەرەنجڕاکێش، سەروکارمان لەگەڵ تەوژمێکی باڵادا هەیە کە لە باری بە چنگکەوتنی دەسەڵاتی خۆشەویستیدایە. ئەم تەوژمە باڵایە ئیدی خوداوەند نییە، بەڵکو حیزب و ڕێبەرە گشتییەکەیەتی.

دەستەواژەی «ڕێبازی کەسایەتی» بە باشی دەرخەری ئەم جۆرە گوستنەوە بەکۆمەڵەی خۆشەویستییە بۆ فیگەری سیاسی. شاعیرانیش دەرگیری ئەم بابەتە بوونە: تەماشای سرووده سیاسییەکانی ئیلوارد بۆ ستالین و گۆرانییەکانی ئاراگۆن لەمەڕ گەڕانەوەی مۆریس تورز بۆ فەرەنسا پاش نەخۆشییەکەی... لە دیدی من ڕێبازی حیزبایەتی هەمدیس سەرەنجڕاکێشترە. ئاراگۆن ئەم بابەتەی بەباشی نیشان داوە: «حیزبەکەم ڕەنگەکانی فەرەنسای بۆ گەڕاندمەوە» ...هتد. ئاواز و دەنگی خۆشەویستی لەم دەستەواژەیەدا بەروونی دەبینرێت. وشەکان چ بۆ حیزب و چ بۆ ئەلیسا تریۆلت، خۆشەویستەکەی، نوسرابن زۆر هاوشێوەن. بینینی ئەوەی کە چۆن حیزبێك بەم چەشنە بە فۆرمی بتێك دەردەکەوێت، شایەنی پەندلێوەرگرتنە؛ ئەو پارتەی کە واپێدەچوو ئامرازێکی کاتی بێت بۆ ڕزگاربوونی چینەکانی کرێکار و خەڵك. مەبەستم نییە هیچ کام لەمانە بە هۆکارەکانی سەرگەرمی دابنێم: ئەمانە بە قۆناغێك لە حەز و ئارەزووی سیاسییەوە پەیوەست بوون کە ئیدی ناتوانین درێژەیان پێ بدەین، لەم ڕووەوە، دەبێ ڕەخنەگرانە لێیان بڕوانین؛ قۆناغێکی پڕ حەز و ئارەزوو و هەوراز و نشێو کە وەفادارەکانی ملیۆنان کەس بوون. سەرەنجدان لەوەی بابەتەکەمان خۆشەویستییە، ئەوە لێرەدا پێویستە بڵێین

ئەمەیە خۆشەویستی و ئارەزووی سیاسی کە هەرگیز ناشێ لەگەڵ یەك تێکەڵی بکەین. ئەو کێشەیەی کە سیاسەت ڕووبەرووی بۆتەوە کۆنترۆڵی کینە و نەفرەتکردنە، نەك کۆنترۆڵی خۆشەویستی. نەفرەتکردن هەستێکی توندە کە تاڕادەیەك بەشێوەیەکی حەتمی، پرسی دوژمن بەرباس دەکات. بە دەربڕینێکی تر، لە سیاسەتدا، ئەوەی کە دوژمنان لە کاردان، یەکێکە لە ڕۆڵەکانی دامەزراوە، جا هەر دامەزراوەیەك بێت، کۆنترۆڵ و لە ڕاستیدا لەنێوبردنی ئاکامەکانی نەفرەتە. ئەمە بەو مانایە نییە کە دەبێ باس لە «تەڵقینی خۆشەویستی» بکات، بەڵام قەیرانێکی سەرەکی ڕۆشنبیرانە هەیە کە بریتییە لە بەدەستهێنانی سنوردارترین و وردترین پێناسەی گونجاو لە دوژمنی سیاسی، نەك پێناسەیەك وەك ئەوەی بە درێژایی سەدەی ڕابردوو بەڕاست دانراوە، واتە ئاڵۆزترین و بەربڵاوترین پێناسەی وێناکراو.

**پ: ئاخۆ وا باشتر نییە سیاسەت لە خۆشەویستی جیا بکەینەوە؟**

**ئالان بادیۆ:** پانتایەکی بەرفراوان لە بیرکردنەوەی هاوچەرخ هەوڵ ئەدات ئەوەی بەهەڵە تێکەڵی یەك کراوە، لە یەك جیا بکاتەوە. بەو چەشنەی کە پێناسەی

دوژمن دەبێ کۆنترۆڵ و سنوردار و کورت بکرێتەوە، خۆشەویستیش وەك جۆرێ کارەساتی پشت ئەستوور بە پاشکۆی هەقیقەتی جیاوازی، دەبێ وریایانە و بە وردیی لە سیاسەت هەڵبوەشێنرێتەوە. کاتێ لە گریمانەی کۆمۆنیستی دەدوێین، دەمانەوێ ئەوە بخەینە ڕوو کە ئیشکالییەتی هەنوکەیی سیاسەتی ڕزگاریبەخش دەبێ لە ژیانەوە و قیامەتی ئایدیای کۆمۆنیستی دەربخرێت، ئەو ئایدیا جیهانییەی کە تەسلیمی هەڵپەی خاوەندارێتی تایبەتی نابێت، جیهانی یەکسانی و بەشداری ئازاد. بەم مەبەستە دەتوانین سوود لە ئامرازە فەلسەفییە تازەکان و، ژمارەیەك لەو ئەزموونە سیاسییە لۆکاڵییانە وەربگرین کە بوونەتە هۆی هاتنەکایەوەی بیرکردنەوەی داهێنەرانە. سەرلەنوێ داهێنانەوەی خۆشەویستی لە چوارچێوەیەکی لەم چەشنەدا، لە بەراورد بەو چوارچێوەیەی کە لە شێتیی سەرمایەداریی دەورگیراوە، ئاسانتر دەبێت. چونکە بەڵگەنەویستە کە هەر شتێکی بەدەر لە بەرژەوەندی ناتوانێ لە گەرمەی شێتییەکی ئاوادا لە ئاسایش و ئارامییدا بێت. خۆشەویستیش وەك هەر پرۆسەیەك کە لە هەوڵی دۆزینەوەی هەقیقەتدایە، لە هەر بەرژەوەندییەك بەدەرە: بەهای خۆشەویستی تەنیا لەخودی ئەو ڕاستییەدایە و لەودیو بەرژەوەندییە بەپەلەکانی دوو کەسە کە دووچاری

بونەتەوە. مانای وشەی «کۆمۆنیزم» ڕاستەوخۆ بە خۆشەویستییەوە پەیوەست نابێت. ویڕای ئەوەش، ئەو وشەیە چەند توانابییەکی تازە بۆ خۆشەویستی لەگەڵ خۆی دێنێت.

**پ: لە ڕەهەندی سیاسەتی کۆمۆنیستییدا، شێوەیەکی گونجاوتر بۆ درەخستنی خۆشەویستی لە ئارادایە. ئەمانە ئەو چیرۆکە خۆشەویستییانەن کە لە بەستێنی مانگرتن و بزوتنەوە کۆمەڵایەتییەکاندا چەکەرە دەکەن. زۆرجار پێداگری لەسەر ئەم شێوەیە دەکەیتەوە، چونکە ڕێگە بە تێپەڕین لە خۆشەویستی دەدات تاوەکو بە تێپەڕینی سیاسیی سەردەمەکەی خۆیەوە ببەستێتەوە. تایبەتمەندییەکانی خۆشەویستی لە سەردەمی ململانێ چییە؟**

**ئالان بادیۆ:** من بە شێوەیەکی تایبەت بەرامبەر بەم لایەنەی کاروبارەکان هەستیارم، لەبەرئەوەی بەشێکی بەرچاو لە نووسینەکانم وەك ڕۆماننوس و شانۆنامەنووس بەم بابەتەوە پەیوەست کردووە. لە شانۆنامەیەکمدا، «شاڵی سوور» ، کارەساتەکە بەشێوەیەکی سەرەکی بە خۆشەویستیی نەگونجاوی خوشك و برایەك لە ڕێگەی

ڕووداو و ڕووداوەکانی بزوتنەوەیەکی سیاسیی مەزن پەیوەست دەبێت کە پێکدێت لە جەنگە ئازادیخوازییەکان، دەمارگیرییەکان و گردبوونەوە گشتییەکان. لە ڕۆمانێکمدا بە ناوی «خشتی خامۆشی ئەم خوارەوە» (کە پەیڕەوی لە بونیادی فۆرماڵی بێ نەواکانی ڤیکتۆر هۆگۆ دەکات) ڕەنگی شۆرشگێڕی خۆشەویستیی کرێکاری شیعە، ئەحمەدی ئەعزەم، بۆ تیرۆریستێك، ئیلیزابێس کیتلی، لە خۆیدا دەگونجێنێت و پاشان خۆشەویستی سایمۆن، کوڕی ئیلیزابێس، کە لە دوای مەرگی ئیلیزابێس لە لایەن ئەحمەدەوە بۆ منداڵەکەی پەسند کراوە، بە کلود ئوگازاڤارا، شاعیر و کچی کۆنەپەرستێکی دەستبالا، وەسف دەکات. مەبەستم لە هێنانی تەواوی ئەم نموونانە بەرجەستەکردنی لێکچوونی نێوان خۆشەویستی و ڕاسپاردنی شۆرشگێڕی نییە، بەڵکو بەرجەستەکردنی جۆرێك زایەڵەی شاراوەیە کە لە ڕەوتی بەناوەکیکردنی ئەزموونی کەسی دێتە کایەوە؛ زایەڵەیەك لە نێوان ئەو حەز و ئارەزووەی کە ژیان، لە شێوەی ڕاسپاردنی تەواو بە ئایدیایەك بەتایبەت، بەدەستدەهێنێت و ئەو ئارەزووە جیاوازەی کە لە خۆشەویستی و لە ململانێ لەگەڵ جیاوازی بەرهەم دەهێنرێت. دۆخێکی ئاوا هاوشێوەیە لەگەڵ دوو ئامێری مۆسیقی کە لەڕووی لاشە و بەهێزی دەنگ بەتەواوی

جیاوازن، بەڵام ئەو کاتەی کە مۆسیقازانێکی مەزن هەر هەموویان لە بەرهەمێکدا کۆدەکاتەوە و بەکاریان دەهێنێت، بەشێوەیەکی سەرسورهێنەر پێکەوە تەبا دەبن. لێرەوە دەمانەوێت بڕیار بدەین. من لەم بەرهەمەوە ڕاپۆرتی ژیان لە دوو توێی کتێبی **«ساڵانی سوور»** (**red years**)، لە نێوان مانگی ئایاری ٦٨ و دەیەی ٨٠، نووسیوە. لەم قۆناغەوەیە کە من بۆچوون و بڕوای پتەوی سیاسییم پێکهێنا کە تا هەنوکە سەرسەختانە پێیەوە پاپەندم و «کۆمۆنیزم» ناوێکی گونجاوە بۆ ئەو ڕاستییە. بەڵام لە لایەکی تر، هەروەها ژیانی داهاتووم لە دەوری پرۆسە کەم تا زۆر بنجبڕەکانی خۆشەویستی دەخولێتەوە. هەر چەندە پاشان و بەهەمان شێوەش ڕوویدا، بە هەمان سوودوەرگرتن و چییەتییە بەردەوامەکەی ڕوونکرابۆوە. بە دەربڕینێکی دیاریکراو، بەو چەشنەی کە پێشتر گوێم لێبووە، بۆچوونی پتەو لە خۆشەویستی و سیاسەت ئەو شتەیە کە هەرگیز نابێ چاوی لێ بپۆشین. ئەمە بەڕاستی هەر هەمان ئەو ساتەوەختە بوو کە ژیانم لە میانەی خۆشەویستی و سیاسەتی وەتەری مۆسیقایی دۆزیەوە کە هارمۆنییەکەی دەستەبەر دەکرد.

**پ: له کتێبێکتدا بەناوی سەدە، یەکێك لە دەقەکانی ئەندرێ بریتۆن واتە «*ئەرکان ١٧*» «Arcanum ١٧» دەخەیتە بەر باس و پیشانی ئەدەیت کە چۆن سەدەی بیستەم، لە ڕووی پەرەسەندن و بڵاوکردنەوەی خۆشەویستی وەك میتافۆرێك بۆ هەقیقەت، سەدەیەکی مەزنە. بەڵام مەبەستی ئەندرێ بریتۆن کە لە مانفێستەکانی سوریالیزمەوە دەیەوێ «هونەر بە سادەترین شێوەی دەربڕین واتە خۆشەویستی» کورت بکاتەوە، چییە؟**

**ئالان بادیۆ:** پرۆژەی سوریالیستی خاڵە ناوەندییەکەی هەر ئەمە بوو کە ڕێك لە سەرەتاوە ئاماژەم پێیکرد، واتە پەیڕەویکردن لە ڕامبۆ بەمەبەستی داهێنانی دووبارەی خۆشەویستی؛ لە دیدی سوریالیستەکان، داهێنانی دووبارەی خۆشەویستی تا ئەبد و بۆ هەمیشە بە بزاوتێکی هونەری، ئۆنتۆلۆجی و سیاسی یەکسان بوو. ئەوان هیچکات ئەم بزاوتەیان لەبەر یەك هەڵنەوەشاندۆتەوە.

هونەر تایبەتمەندی و خاڵێکی بەهێزی هەیە، بەم مانایەی کە مافی ڕووداوەکان بە باشی ئەدا دەکات. پێناسەیەکی گونجاو لە هونەر ئەشێ بەم چەشنە بێت: هونەر، لە پلەی بیرکردنەوە، ئەو شتەیە کە مافی ڕووداو بە تەواوی و بێ گرفت ئەدا دەکات. لە سیاسەتدا، ڕووداوەکان بە تێپەڕینی مێژوو، لە ڕابردووەوە تا هەنوکە، سیستەماتیک دەبن، بەڵام هونەر لە کردەی گێڕانەوە یان بە گوزارشتێك، هەوڵدان بە مەبەستی گەڕاندنەوەی دەسەڵاتی بێ ڕادەی ڕووداوەکان تەنیایە. ئەوە تەنیا هونەرە کە ڕەهەندی هەستەکان بەرەو ڕووبەڕووبونەوە، شۆرش یان ئاشوب دەبات. هونەر لە تەواوی فۆرمەکانییدا، ئاوێنەی تەواوی خودی ڕووداوە. شێوەکارێکی مەزن بە میتۆدی خۆی شتێك دەکێشێت کە زەحمەتە شێوەکارێك تەنیا بۆ پێشانگای شانۆ کورت بکرێتەوە. ڕووداوی پەنهان دەردەکەوێت و ڕەنگیشە بتوانین بڵێین ئەوەی دەتوانیت ببینیت، بیخەیتە لاوە. بیرتۆن ئەوەی خستۆتە ڕوو کە هونەر لە گۆشەنیگایەکەوە پەیوەندییەکی زۆر نزیکی لەگەڵ خۆشەویستییدا هەیە، لەبەرئەوەی خۆشەویستی لە بنەڕەتدا هەر هەمان ئەو ساتەوەختەیە کە ڕووداوێك، بوون دەخاتە لاوە و لێی دوور دەکەوێتەوە. ئەمە ڕوونکردنەوەیەکە بۆ «خۆشەویستی

شێتانه». خۆشەویستی بۆ هیچ یاسایەك كورت ناكرێتەوە. هیچ یاسایەك بۆ خۆشەویستی بوونی نییە.
وێڕای ئەوەش، هونەر زۆرجار شێوەیەكی ناكۆمەڵایەتییانەی خۆشەویستی نیشان داوە. وێڕای گوتەی ڕەشكۆانە، جگە لەم هەموو وشانە، «ئاشقان لەم جیهانەدا تەنیان». تەنیا ئەوان هەڵگری ئەو جیاوازییانەن كە لە ڕێگەی ئەو دنیاوە ئەزموونی دەكەن. سوریالیزم «خۆشەویستی شێتانە» وەك دەسەڵاتی ڕووداوێك كە لەودیو هەر یاسایەكە، ستایش دەكات. بیركردنەوەی لكاو بە خۆشەویستی ئەو بیركردنەوەیە كە لە بەرامبەر هەر چەشنە نەزم، لە بەرامبەر سیستەمی دەسەڵاتداری یاسادا دێتە كایەوە. بیركردنەوەیەكی لەم چەشنە. لە دیدی سوریالیستەكان سەرچاوەی وزەیەكە بۆ ئارەزوویان بەرامبەر شۆرشی شاعیرانە لە زمان و، ئارەزوویان بۆ شۆڕشی شاعیرانە لە بووندا. لەم گۆشەنیگایەكەوە، ئەوان زۆر پەیوەست بوون بە خۆشەویستی و ئارەزووی سیكسی وەك بنەڕەت و پشتیوانێكی بەزەبر بۆ شۆڕش لە بووندا. بە پیچەوانەوە، ئەوان بەرگری لە خۆشەویستی دەكەن وەك شیعرێكی بەشكۆی یەكتربینین. بۆ نموونە، لە ڕۆمانی ***نادیادا***، كە وێناكردنێكی شكۆمەندە لە شیعرناسی دیداری نەپچڕاو

و نهێنییه، ئەو دیدارەی کە لە داهاتوویەکی نزیکدا لە بۆتەی «خۆشەویستی شێتانە»دا دەردەکەوێ. دیداری پەتی ڕێك خاڵی بەرامبەری هەر شتێکە کە پێشتر بەرنامەت بۆ دارژتبێ یان بیرت لێ کردبێتەوە، بەڵام نە لە پلەی ئارامگرتن، نە لە هیچ ڕەهەندێکی جاویدانەیی. ئەگەرچی هەندێ لە فەیلەسوفەکان پێیانوایە جاویدانەیی واتە ساتەوەخت. ئەم ئایدیایە لە بیرکردنەوەی یۆنانی دەدۆزینەوە. تەنیا ڕەهەندی زەمەنی گونجاو بۆ جاویدانەیی ساتەوەختە. ئایدیایەکی وەها پاڵپشتی لە بۆچوونی بریتۆن دەکات. ساتەوەختی موعجیزەیی یەکتربینین، جاویدانیی خۆشەویستی دەردەکەوێ، وێڕای ئەوەش، هەوڵ ئەدەین ئەوە بخەینە ڕوو کە تێگەیشتنێك لەو خۆشەویستییەی کە کەمتر موعجیزەئاسایە و پتر تێکۆشەرانەیە، واتە بیناکردنی جاویدانەیی لە ماوەیەکی زەمەنییدا، و بیناکردنی سات لە دوای ساتی ئەزموونی «دوو». من لەگەڵ موعجیزەی یەکتربینین هاوڕام، بەڵام پێموایە لەو شێوەیەی کە ئەم موعجیزەیە جیا بکرێتەوە و بەرەو پەرەسەندن و پێکهاتنی تاقەتپڕوهێنی هەقیقەت نەڕوات، لە چوارچێوەی شیعرناسیی سوریالیستیی دەمێنێتەوە. لێرەدا دەبێت باری مانایی وشەی تاقەتپڕوهێن بە ئەرێنی دابنرێت. قسەکردنە

لە کار و هەوڵەکان لە پێناو خۆشەویستی: خۆشەویستی جۆرێك نییە لە موعجیزە. دەبێ زرینگ و وریا و هوشیار بیت: دەبێت لەگەڵ خۆت و ئەویتردا یەکدڵ و یەك زمان بیت. لەم ڕەوشەدا، پتر لە هەر کاتێکی تر بیر دەکەیتەوە، کار دەکەیت و دەگۆڕێیت. ئەو کات بەشێوەیەکی بنجبڕ شادمانی و دڵخۆشی لە هەوڵی ئەوەدایە وەك پاداشتێکی نەمریی ئەو هـەموو کار و هەوڵانە بەردەوام ئامادە بێت.

**پ: ئاماژە بەردەوامەکانت بۆ ساموێل بێکێت لە پەیوەست بە خۆشەویستی تووشی سەرسورمانم دەکات. بە زەحمەت دەتوانین بڵێین بەرهەمەکانی ساموێل بێکێت جەخت لە شادمانی دەکەنەوە. بەدیدی تۆ، بەرهەمەکانی بێکێت کە بە هۆی نهێلیستی و ڕەشبینییەکانییەوە بەناوبانگن، چۆناوچۆن بە شانۆی «دوو» کە هەر هەمان خۆشەویستییە هاولایەنن؟**

**ئالان بادیۆ:** بەو جۆرەی پێشتر وتم، ئەدەبیاتی لیوانلێو لە خۆشەویستی لەخۆگری بەرهەمی ئەدەبی زۆرە لەبارەی ئەزموونی بەردەوامی خۆشەویستی. ئەم بابەتە زۆر بەرچاو و پڕبایەخە. بۆ نموونە، شانۆ لەبەرچاو بگرە. ئەگەر لە دیار ئەو نمایشانەوە دانیشیت کە باس لە ململانێی

خۆشەویستە گەنجەکان لە دژی ستەمکاری خێزان دەکەن (کە ناوەڕۆکێکی کلاسیکە) دەتوانیت ناونیشانی لاوەکیی سەرکەوتنی خۆشەویستی ماریۆڤ بەهەموویان بدەیت. ژمارەیەکی زۆر شانۆ بەم ستایلە سەرگوزەشتەی خۆشەویستانی گەنج باس دەکەن، وەك ئەوەی زۆرجار چۆن بە یارمەتی خزمەتگوزار یان هاوڕێیانی تر، دایك و باوکە پیرەکەی خۆیان دەست بەسەر دەکەن و دواجار ئەوەی دەیانەوێ، واتە هاوسەرگیری، ئەنجام دەدەن؛ ئەمەش بە مانای سەرکەوتنی خۆشەویستییە، نەك کات بەسەربردن. ئەمە ڕێك هەر هەمان شتە کە پێدەچێ بە خستنەڕووی چیرۆکی ڕووبەڕووبونەوە لە قەڵەم دەدرێت. بەرهەمە گرینگ و ڕۆمانە گەورەکان، خەریکی باسکردنی مەحاڵی خۆشەویستی، تاقیکردنەوەی وجودی، تراژیدیایەکەی، ئازارەکەی، جودایی و کۆتاییەکەیەتی.... هتد. ویڕای ئەوەش، ژمارەیەکی زۆر کەم لەو چیرۆك و ڕۆمانانە، ڕوانگەیەکی پۆزەتیڤیان بەرامبەر بە پرۆسەی خۆشەویستی وەك بنەمایەکی پتەو هەیە. تەنانەت ئەتوانین بڵێین ژیانی هاوسەرگیری بەدەگمەن بۆتە هۆی بەرهەمهێنانی بەرهەمێکی ناسراو، ئەمەش ئەو ڕاستییەیە کە بەدڵنیاییەوە بۆتە ئیلهامبەخشی هونەرمەندەکان.

وێڕای ئەوەش، لە بەرهەمەکانی بێکتدا، کە بە مێژوونووسی نائومێدی ناسراوە، ڕێك پێچەوانەکەی دەبینین: ئەو لەبارەی سەرسەختی و بەردەوامێتی خۆشەویستی شتی نوسیوە. بۆ نموونە، شانۆنامەی **ڕۆژە شادەکان** کە چیرۆکی هاوسەرێکی پیری لەبەرچاو گرتووە. تەنیا ژن دەبینێت، پیاوی پشت تەختەشانۆ ئامادەییەکی کەم و هەستپێنەکراوی هەیە، هەموو شتێك ڕوو بەرەو خراپبوونە، ژنەکە لە نقومبوونی ژیانیدایە، بەڵام دەڵێت: «چ ڕۆژانێکی خۆش و پرشادیمان بەسەربرد!» ئەو ئەم وشەیە بەم هۆیە دێنێتەوە کە هێشتاش خۆشەویستی لە نێوان ئەو دووانەدا هەیە. خۆشەویستی توخمی بەهێز و نەگۆڕدراوە کە بوونە بەڕواڵەت پڕکێشەکەی درووستی کردووە. خۆشەویستی دەسەڵاتی شاراوەیە لەنێو ئەو موسیبەتەدا. بێکت لە دەقێکی وروژێنەر و کورت بەناوی **بەسە «Enough»**، سەرگەردانییەکانی هاوسەرێکی زۆر بەتەمەن لە چوارچێوەی سیناریۆیەکی پڕ هەوراز و نشێو دەگێڕێتەوە. ئەم دەقە چیرۆکی خۆشەویستی ئەم هاوسەرە بەتەمەنەیە کە بە هیچ شێوەیەك ڕەوشی کارەساتباری جەستەیان، یەکڕەهەندی بوونیان، دژواری یەکجار زۆری ئارەزووی سێکسی و ... هتد، ناشارنەوە.

دەقەکە تەواوی ئەم بابەتە دەگێڕێتەوە، بەڵام ناوەندی چیرۆکەکە دەسەڵاتی شکۆمەندی خۆشەویستی و لە ژێر بەرجەستەبوونە کۆڵەکەدارەکەیدایە.

**پ: لەبەرئەوەیە ئاماژە بە هونەری دراما دەکەیت، دەخوازم ئاماژە بە خۆشەویستییەکی زۆر تایبەت بکەم کە لە ناخی منداڵییەوە هەڵدەقوڵێ. خۆشەویستی بۆ شانۆ. پێش ئەوەی کە سێینەکی (Trilogy) خۆت لەبارەی ئەحمەدەکان بنووسیت، کە جۆرێ سکاپنی هاوچەرخ دەهێنیتە سەر تەختەشانۆ، خۆتان لە لاویدا ڕۆڵێکی سەرەکیتان لە شانۆگەری (Molieres Les fourberies de scapin)ـی مۆلێردا گێڕاوە. چییەتی ئەم خۆشەویستییە لەمێژینەیەتان بۆ شانۆ چییە؟**

**ئالان بادیۆ:** خۆشەویستیم بۆ شانۆ پرسێکی زۆر ئاڵۆزە و بۆ ماوەیەك پێش ئێستا دەگەڕێتەوە. ڕەنگە ئەم خۆشەویستییە لە خۆشەویستیم بۆ فەلسەفە بەهێزتر بێت. خۆشەویستیم بۆ فەلسەفە پاشان، ئارامتر و بەردەوام بە دژوارییەکی زیاتر، زەق دەبێتەوە. پێموایە لە گەنجێتیدا، لەسەر سەکۆی نمایشکردندا، هەستێکی زگماك هەبوو، هەستێکی هەڵقوڵاو لەمەی کە بەشێکە لە زمان و شیعر

بەشێوەیەکی تاڕادەیەك ناڕوون پەیوەندی لەگەڵ جەستە دەبەستێت. لە بنەڕەتدا، بە ئەگەرێکی نزیك لە دڵنیاییەوە، شانۆ میتافۆرێك بوو بۆ ئەوەی خۆشەویستی پاشان وابڕیاربوو هەبێت، لەبەرئەوەی شانۆ ئەو ساتەوەختەیە کە بیر و جەستە بە ڕێگەیەك هاوشێوە و لێکجیانەکراوەن. ئەوان بە چەشنێك لە بەرامبەر یەك ڕووت دەبنەوە کە بە زەحمەت دەتوانرێ بڵێین «ئەم جەستەیە» یان «ئەم ئایدیایە». ئەم دووانە ئاوێزانی یەکترن، زمان جەستە بەدەستدەهێنێت، ڕێك وەك ئەو کاتەی کە بەکەسێك دەڵێیت «خۆشمدەوێی». ئەم وشەیە بەکەسێك دەڵێیت کە زیندوو و ئامادەیە و لە بەرامبەرت ڕاوەستاوە، بەڵام شتێك دێتە نێو گوتارەکەتەوە کە زەحمەتە بۆ ئەم ئامادەییە ماددییە پەتییە کورت بکرێتەوە، ئەو شتەی کە بێگومان هەم لە ناخ و هەم لەودیوشیەتی.

شانۆش لە بنەڕەتدا هەمان شتە، جەستەی بیرمەند و بیرکردنەوەی بەرجەستەکراو. بەو چەشنەی کە دەزانین، لە شانۆدا چەندان دووبارەبوونەوە و ڕاهێنان هەیە. دەرهێنەرەکان دەڵێن: «سەرلەنوێ ئەنجامی بدەنەوە» بیرکردنەوە بەساکاری بەرەو جەستە نایەت. پەیوەندی بیرکردنەوە بە فەزا و جوڵە ئاڵۆزە. ئەم پەیوەندییە دەبێ

هاوکات خۆبزواو و هەڵگری پرۆژە و نەخشەی پێشوتر بێت. شتێکی لەم چەشنە لە خۆشەویستیشدا ڕوودەدات. ئارەزووی بێ ناوبڕ بەهێزە، بەڵام خۆشەویستی پێویستی بە بایەخ و تێگەیشتنە تازەکانە. خۆشەویستی لەگەڵ پێویستبوون بە ئاشقبوونی سەرلەنوێ بەتەواوی ئاشنایە؛ چەند ڕستەیەکی لەم دەستەیە: «دووبارە پێم بڵێ کە ئاشقمبووی» و «ئەم جارەیان باشتر بیڵێ»، ئەوکات ئارەزووی هاوشان بەو گوتە خۆشەویستییانەی کە گوێت لێدەبێت دووبارە بەکاریدەهێنێت: هەڵبەت لەو کاتەی خۆشەویستی ئەوان بەرەو پێشیان دەبات، قسەگەلی وەك: «هەمدیس! هەمدیس!» لەو ساتەوەختەی کە حەزی فیگەرە جەستەییەکان بە جەختکردنەوە لەسەر وشەیەك یان ئەو ڕاگەیاندنەی کە بەردەوام لە دۆخی نوێبوونەوەدایە، دەگەشێتەوە. ئەوەش دەزانین کە ناوەرۆکی خۆشەویستی وەك جۆرێك گەمەکردن لە شانۆدا گرینگ و دیاریکەرە و، شانۆ بەگشتی سەروکاری لەگەڵ ڕاگەیاندنەکاندا هەیە. هەروەها بە هۆی ئەم شانۆیە، خۆشەویستی و ئەم گەمەکردنە بەهێزەی خۆشەویستی و هەبوونی شانسە کە من بەم چەشنە ئاشقی شانۆ بووم.

**پ: ئەنتوان ڤیتز، ئەو شانۆنامەنووسەی کە ئۆپێراکەتانی واتە (LEcharpe Rouge) لە ساڵی ١٩٨٤ لە ڤیستیڤاڵی ئاڤیگنۆن و بە مۆسیقای جۆرج ئاپرگیس هێنایە سەر تەختەی شانۆ. هەروەها ئەم بیرۆکەیەش سەرکەوتوو بوو. ئەو لە شوێنێکدا دەنووسێت: «ئەم شانۆنامەیە ڕێك هەمان ئەو شتەیە کە من هەمیشە ویستوومە بیبەمە سەر تەختەی شانۆ: نمایشکردنی پەلاماری توندوتیژانەی بیرکردنەوە-ئایدیاکان و ئەوەی کە چۆناوچۆن جەستەکان ئەشکەنجە دەدرێن و پاشان تەسلیم دەبن.» ئایا لەگەڵی هاوڕایت؟**

**ئالان بادیۆ:** بەتەواوی. تەماشاکە، پیسوا، شاعیرە پورتورگالیەکە، لە شوێنێکدا دەڵێت: «خۆشەویستی جۆرێکە لە بیرکردنەوە.» ئەم گوزارەیە زۆر پێکدژ دەردەکەوێت، چونکە خەڵك بەردەوام دەڵێن بابەتی خۆشەویستی لەبارەی جەستە، ئارەزوو، هەست و بەشێوەیەکی گشتی هەر شتێکی جگە لە بەڵگەخوازی و بیرکردنەوەیە. لەبەرئەوەیە ئەو دەڵێت: «خۆشەویستی جۆرێکە لە بیرکردنەوە.» بە دیدی من، ئەو ڕێك وا دەڵێت. منیش پێموایە خۆشەویستی جۆرێکە لە بیرکردنەوە و پەیوەندی نێوان بیرکردنەوە و جەستە بەتەواوی کەسییە، و بەگوێرەی گوتەی ئەنتوان ڤیتز، بەردەوام

بە زەبروزەنگێکی نەچەپێنراو وەسف دەکرێت. ئێمە لە ژیاندا زەبروزەنگێکی ئاوا ئەزموون دەکەین. بەڕەهایی ئەوە ڕاستە کە خۆشەویستی دەتوانێ جەستەکانمان تەسلیم و بکاتە کۆیلەی خۆیی و دژوارترین ئەشکەنجەکان بهێنێتە کایەوە. خۆشەویستی بەو چەشنەی کە ئێمە ڕۆژانە دەیبینین، ڕووبارێکی ئارام و دوورودرێژ نییە. ئێمە هەرگیز ناتوانین تاڕادەیەك ئەو خۆشەویستییە ترسهێنەرەی کە بە خۆکوشتن یان کوشتن کۆتایی پێدێت لەیاد بکەین. خۆشەویستی لە شانۆدا بەتەواوی، یان تەنانەت خۆویستانە، گیانبازی سێکسی یان ڕۆمانسی بێگەرد نییە، بەڵکو پەیوەندییەکی هەم تراژیدی، هەم نەویستراو و هەم توندە. پەیوەندی نێوان شانۆ و خۆشەویستی تاوتوێکردن و ناساندنی شکۆفەیەکی قووڵە کە مرۆڤەکان لە یەك جیا دەکاتەوە و وەسفکردنی چییەتیەکی شکێنەر کە خۆشەویستی نێوان دوو گۆشەگیری بەرپا دەکات. بەردەوام دەبێ بۆ ئەم پرسیارە بگەڕێینەوە: چ جۆرە بیرکردنەوەیەك خۆی لە هات و چوونی نێوان دوو جەستەی سێکسواڵێتی ئاشکرا دەکات؟ هەروەها دەبێ لە درێژەی پرسیارەکە لە خۆمانیش بپرسین کە ئەگەر خۆشەویستی بوونی نەبێت، شانۆ لە چ شتێك دەدوێت؟ وەڵامەکە دەبێتە سیاسەت.

شانۆ تا ئەهەنوکە بە تێروتەسەلی لە سیاسەت دواوە. بەم چەشنە، دەتوانین بڵێین، شانۆ واتە خۆشەویستی و سیاسەت، و بە دەربڕینێکی تر، شانۆ لەبارەی تێگەیشتنی ئەم دووەیە. لێکەوتی نێوان خۆشەویستی و سیاسەت پێناسەیەکی گونجاوە بۆ تراژیدیا، بەڵام خۆشەویستی بۆ شانۆ هەر خۆشەویستی بۆ خۆشەویستییە، لەبەرئەوەی بێ چیرۆکە خۆشەویستییەکان و بێ ململانێ لە ڕووی ئازادکردنی خۆشەویستی لە کۆت و بەندە خێزانییەکان، شانۆ مانایەکی ئەوتۆی نییە. کۆمیدیا کلاسیکییەکانی وەك شانۆنامەکانی مۆلێر پێمان دەڵێن کە چۆن کەسانی گەنج بەرێکەوت و بەگوێرەی شانس یەکتر دەبینن، دەبێ پایەی ئەو هاوسەرگیرییەی کە دایك و باوکیان بۆیان دارشتووە سست بکەن. باوترین و ڕوونترین ململانێ لەسەر سەکۆی شانۆ، ململانێی خۆشەویستی بەبەخت دژی یاسای سازشنەکراوە. بەدەربڕینێکی تر، ئەم ململانێیە، ململانێی گەنجەکان بۆ یارمەتی کرێکاران (کۆیلە و پێشخزمەتەکان) دژی ئەو بەتەمەنانەیە کە کڵێسا و دەوڵەت یارمەتیان دەدەن. هەنووکە دەڵێیت: «ئازادی سەرکەوتوو بوو، ئیدی هیچ هاوسەرگیرییەکی بەرنامەبۆدارێژراو لە ئارادا نییە: کەپڵ واتە داهێنانی پەتی.» من هێندە دڵنیا نیم. ئازادی؟

ڕێك چ جۆرە ئازادییەك؟ بە چ نرخێك؟ بەڵێ، ئەمەیە پرسیاری واقیعی: خۆشەویستی لە کاتی بەدەستهێنانی ڕواڵەتی ئازادی خۆی، چ بەهایەکی دەبێت؟

**پ: لەبەرئەوەیە کە بەشێکی تەمەنتان لە بەشداریکردنی شانۆ و نێو ئەکتەران و تەکنیکیەکان گوزەراندووە، ئاخۆ خۆشەویستیتان بۆ شانۆ لەخۆگری خۆشەویستیتان بۆ جڤاتێ، کۆیەك نییە؟ ئاخۆ شانۆ هەڵگری ئەو خۆشەویستییەیە کە پەیوەستە بە سیستەمی هەستی برایانە؟**

**ئالان بادیۆ:** بەڵێ، بێگومان. خۆشەویستییەکی لەم چەشنە بوونی هەیە! شانۆ جۆرێکە لە بەیەکەوەبوون و دەربڕینی ئیستاتیکییانەی برایەتی. بەم هۆیەیە کە من وا بیردەکەمەوە کە، بەمانای باسکراو، شتێکی کۆمۆنیستی لە شانۆدا هەیە. تێگەیشتنی من لە «کۆمۆنیست» ئەو شتەیە کە دەبێتە هۆی زاڵبوونی مەرامێکی هاوبەش لەسەر خودخوازی و دەستکەوتی بەکۆمەڵیی بەرژەوەندی تاکەکەسی. هەنوکە باس لە چەمکی «کۆمۆنیست» دەکەین، دەتوانین شتێکی لەم چەشنە بڵێین کە خۆشەویستی لەو مانایەدا گاتیگۆرییەکی کۆمۆنیستییە، هەڵبەت لەو شێوەیەی کە

تاك بەو چەشنەی كە من تێگەیشتوومە تێبگا بابەتی واقیعی خۆشەویستی پەیدابوونی كەپڵە، نەك تێركردنی پەتیی تاكەكان وەك بەشە پێكهێنەرەكانی. دووبارەش پێناسەیەكی تر لە خۆشەویستی: كۆمۆنیزمی كەمینە.

بە گەڕانەوە بۆ شانۆ بەردەوام لە ژێر كاریگەری ئەم ڕاستییەدا بوومە كە گرووپی گەڕۆكی شانۆ، لەرزۆك و سستە. بیركردنەوە لەو كاتانە بەڕاستی بێزاركەر و تاقەتپڕوهێنە كە گرووپیش لەبەریەك هەڵوەشێتەوە: بەردەوام پێكەوە لە گەشتدا بوونە، بۆ ماوەی یەك مانگ پێكەوە ژیاون و بێ ئاگایانە هەموو كەسێ بە ڕێگای خۆیدا هەنگاو هەڵدێنێت. شانۆ بریتییە لە ئەزموونی ئەم جیابوونەوەیە. كاتێ ئەو برایەتییەی كە لە جێبەجێكردنی شانۆكەدا شاردراوەتەوە لەبەریەك هەڵدەوەشێتەوە، ساتەوەختێكی پەیوەست بە مالیخولیایەكی توند لەكاردا دەبێت. «ئەمەش ژمارە مۆبایلی منە. لە پەیوەندیكردندا بووم، بەڕاستی؟»: بەم ئەدەب و شێوە گفتوگۆكردنە ئاشنایت، بەڵام بەڕاستی هیچ كەس زەنگ لێ نادات. ئەمە واتە كۆتایهاتنی كارەساتەكە و هەر كەسێ بەجیا بەرێگای خۆیدا دەڕوات و پرسی جودایی لە خۆشەویستییدا هەڵگری بایەخێكی لەم چەشنەیە كە ئەشێ خۆشەویستی بە ململانێیەكی

سەرکەوتوو لە دژی جیابوونەوە پێناسە بکرێ. گرووپی خۆشەویستیش لەرزۆکە و بۆ بەرپاکردن و پەرەسەندنی پێویستت بە شتێکی زیاتر لە ژمارە تەلەفوونێکە.

**پ: خۆشەویستیتان بۆ شانۆ، لە ناخدا، چۆن خۆشەویستییەکە، واتە لە دیدی ئەو ئەکتەرەی کە سەردەمانێ هەبوویت و ئەشێ دڵتان هەر بۆی لێبدات و جارێکی تر هەندێ لە مەنەلۆگەکانی ئەحمەدی زیرەك یان ئەحمەدی فەیلەسوف «Ahmed le subtile or Ahmed philosophe» ئامادە و جێبەجێ بکەیتەوە؟**

**ئالان بادیۆ:** ئەمە ئەو خۆشەویستییە تاکەکەسییە کە ناچارت دەکات جەستەی خۆت تەسلیم و تووشی زمان و ئایدیاکان بکەیت. بەو چەشنەی کە دەزانیت، هەر فەیلەسوفێك جۆرێك ئەکتەرە، هەر چەندەش دژی گەمە و نیشاندانەکان بێت. فەیلەسوفەکان بەگشتی لە سەردەمی باوباپیرانی مەزنی یۆنانییەکان دەدوێن. لە فەلسەفەدا بەردەوام توخمێك لە ڕووتکردنەوەی کەسیی هەیە: ڕەهەندی زارەکی و گوتاری فەلسەفە لەلایەن جەستە و لە جۆری کردەی گواستنەوە کۆنترۆڵ بکرێت: خاڵی سەرەکی باسەکەمان لەگەڵ ژاك درێدا هەر ئەم مەسەلەیە

بوو. ئەو بۆ نووسین لەگەڵ گوتار دەجەنگا، هەر چەندە خودی ئەو چەند جێبەجێکردنێکی سەیروسەرەمەری خستبووە ڕوو. فەیلەسوفەکان زۆرجار بە هۆی جادووگەربوون، ئەفسونکردنی خەڵك لەگەڵ ئامرازێکی دروستکراو و ڕێنماییکردنیان بەرەو لای ڕاستییە بڕواپێنەکراوەکان لە ڕێگەی چارەنووسە فریودەرەکان بخرێنە بەر سەرزەنشتکردنەوە. کتێبی ***پێنجەمی کۆماری ئەفلاتوون*** (کتێبێکی گەورە و هەمەلایەنانەیە کە من خەریکی ئامادەکردنی وەرگێڕانێکی بێ کەم و کوڕی و زۆر جیاوازی ئەو دەقەم) لەخۆگری پارچەیەکی تەواو سەرسورهێنەرە. سوکرات دەست دەکات بە پێناسەکردنی چییەتی فەیلەسوفی هەقیقی. وەرگێڕان و گێڕانەوەکانم لە گوتەکانی سوکرات بەم چەشنەیە:

«ئاخۆ پێویستە ئەو شتەی کە دەبێ بە ڕوونی هەرچی تەواوتر بێتە بەرچاوت بیهێنمەوە بیرت؟ کاتێ لەبارەی ئەو بابەتەی خۆشەویستی دەدوێین، گریمان دەکەین ئاشق ئەو بابەتەی لە گشتێتییەکەیدا خۆش دەوێت؛ ئێمە ئەم ئەگەرەی کە خۆشەویستیی ئەو بەشێکە لە بابەتەکە هەڵبژێرێ و بەشێکی تری ڕەت بکاتەوە، لەبەرچاو ناگرین.»

**پ: ئەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ ئەو خۆشەویستییەی کە پێویستە سەرلەنوێ دابهێنرێتەوە و داکۆکی لێ بکرێت. لە کتێبی «مانای سارکۆزییدا» ئەوە دەخەیتە ڕوو کە داهێنانی دووبارەی خۆشەویستی بەرگرییەکی گونجاوە لەبەردەم گەمژەیی بازاڕ و ناڕێکیی سیاسی هەنووکەیی لەبەرەی چەپ. بە دیدی تۆ، چۆن ئەشێ خۆشەویستی لەو دنیایەی کە ڕەمزەکەی سەرۆك کۆماری فەرەنسایە، چەشنێك بەرگری بێنێتە کایەوە؟**

**ئالان بادیۆ:** پێموایە پەیبردن بەم واقیعە کارێکی زۆر ورد و جددییە چونکە فەرەنسا هەم وڵاتی شۆڕشەکانە و هەم سەرزەمینێکی گەورەی کۆنەپەرستەکانە، و یارمەتیدەرە بۆ ئەوەی فەرەنسا لە ڕووی دیالێکتیکییەوە دەرك بکەین. زۆرجار لەبارەی ئەم بابەتە لەگەڵ هاوڕێیانی دەرەوەم باس و مشتومڕمان کردووە لەبەرئەوەی ئەوان هێشتاش ئەفسانەی فەرەنسیی بێهاوشێوەی لە

خەیاڵدایە. فەرەنسایەك کە بەردەوام لە ڕیزی داهێنانە شۆرشگێرییەکاندایە. لەم ڕووەوە، بێگومان ئەوان بە هۆی هەڵبژاردنی سارکۆزییەوە تارادەیەك سەریان سوڕماوە. سارکۆزی لەبنەرەتدا بەم ئاسۆیە دەرناکەوێ. من پێیان دەڵێم کە ئەوان مێژوویەك لە فەرەنسا بینا دەکەن کە تێیدا فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری، ڕۆسۆ، شۆرشی فەرەنسا، حوزەیرانی ١٩٤٨، کۆمۆنی پاریس، بەرەی گەل، بەرگری، ئازادیی فەرەنسا و ئایاری ١٩٦٨ لە دوای یەکتر دێن. ئەوانە هەر هەموویان باش و باڵان، بەڵام ئەم گێڕانەوەیە ڕوویەکی تریشی هەیە: گەڕانەوەی بۆربۆنەکان بۆ سەر دەسەڵاتدارێتی لە ساڵی ١٨١٥دا، پەیمانی ڤێرسای، یەکێتی پیرۆز بەدرێژایی جەنگی گەورەدا، پێتاین (**Petain**)، جەنگە کۆلۆنیاڵییەکان و .... سارکۆزی. بەم چەشنە، دوو مێژوو لە فەرەنسادا بەردەستە و ئەم دوو مێژووەش تێکەڵاوی یەکتر کراون. ئەوانەی هیستریای توندی شۆرشگێرییانە هەیە، بە کۆنپەرستییەکی توندڕەو وەڵام دەدرێنەوە. لەم گۆشەنیگایەوە، بە بڕوای من، خۆشەویستیش شوێنی مشتومڕە.

هەندێ کات خۆشەویستی بەردەوام بە ڕووداوە مێژووییەکانەوە گرێدراوە. ڕۆمانتیزم لە خۆشەویستییدا

بە شۆڕشەکانی سەدەی نۆزدەیەمەوە پەیوەستە. ئەندرێ بریتۆنیش هاوشانە بە بەرەی گەل، بزوتنەوەی بەرگری و ململانێی دژەفاشیستی. ئایاری ١٩٦٨ تەقینەوەیەکی مەزن لە تاقیکردنەوەکان لەسەر دەستکەوتە تازەکانی بواری خۆشەویستی و ئارەزووی سێکسی بەرپا بوو. بەڵام ئەوەی فەزاکەی تووشی دابەزین، گرفتاری و کۆنەپەرسی دەکردەوە، بە چەند هەوڵێك بۆ گەڕاندنەوەی شوناسی ئەجێندە ئەنجام دەدرێت. ئەجێندە دەتوانن چەند فۆرمێکی جیاوازیان هەبێت، بەڵام بەردەوام شوناسی خۆیان دەپارێزن و سارکۆزی دواکەوتوو نەبوو. ئامانجی ژمارە یەك: کاریکارانی دەرەوەی وڵات. ئامرازەکەی: وەحشیگەری و توندوتیژی، یاسادانان بەمەبەستی سەرکەوتکردن. ئەو پێشتر ئەو کاتەی وەزیری ناوخۆ بوو، ئەم ئامرازەی تاقیکردبۆوە. گووتاری بەکارهێنراو، شوناسە خۆرئاوایی و فەرەنسییەکان تێکەڵ دەکات. ئەو لەبارەی جێبەجێکردنی ناوچەیەکی کۆڵۆنیاڵی بچووك لە پەیوەست بە «مرۆڤی ئەفریکیی» هیچ گومان و هەست گوناهکردنی نەبوو. پرۆژەی کۆنەپەرستانە، بەردەوام بەمانای بەرگری لە «بەهاکانمان»ـە و ئێمە لە بۆتەی سەرمایەداریی گەردوونی وەك تەنیا شوناس دەردەخات، بەردەوام بە هەر شێوەیەك،

گەڕانەوەیەکی ناشیاوانە بۆ شوناسە. لەبەرئەوەی لۆژیکی شوناسی هەموان بەرەو خۆی ڕادەکیشێت، خۆشەویستی لەبەردەم هەڕەشەدایە. ڕێگایەك کە خۆشەویستی سەرەنجی جیاوازی ڕادەکێشێ، لایەنە کۆمەڵایەتییەکەی، سەرکێشی و سەرسەختییەکەی، و دواجار شێوەی توندوتیژئامێزی هەمووان لەبەردەم هەڕەشەدان. ئەوان هاوشان بە زاڵبوونی ئاسایشییان، برەو بە خۆشەویستی ئارام و دوور لە هەرەشە دەدەن. بەم چەشنە، بەرگریکردن لە پەیوەندی بەراوردکارانە و ناتەبای خۆشەویستی لەگەڵ یاسادا پێویستە. لە کەمینەترین ئاستدا، کەسە ئاشقەکان لەباتی گومانکردن بەرامبەر بە جیاوازی، متمانەی پێ دەکەن. کۆنەپەرستان بەردەوام بەناوی شوناس بەرامبەر جیاوازی لە گوماندان. ئەمەش خاڵی دەستپێکی گشتی فەلسەفەکەیانە. بە پێچەوانەوە، ئەگەر بمانەوێ باوەشی خۆمان بەرووی جیاوازی و ئاکامەکانی بکەینەوە، کۆ (یان کۆلێکتیف) دەتوانێ تەواوی دنیا ببینێت، ئەوکات بەرگریکردن لە خۆشەویستی دەبێتە بنەمایەك کە دەبێ تاکەکان ڕەچاوی بکەن. ڕێبازی شوناسی دووبارەبوونەوە دەبێ بەرەنگای ئەوانە بداتەوە کە جیاوازی، کەسیی و دووبارەنەبووەوەیە. لە ساڵی ١٩٨٢، لە تیۆری سوبێکتدا

نووسیمە: «شتێکت خۆشبوێ کە دووبارە نەیدۆزیتەوە».

**پ: هەروەها، بەو مانایەیە کە فیلمەکەی ژان لۆك گۆدار، واتە «لە ستایشی خۆشەویستیدا»، بەرهەمێکی سینەماییە بە فۆرمی کانتاتایی(cantata)، کە ناونیشانی گفتوگۆکانیشمان هەر لەو بەرهەمەوە سەرچاوەی گرتووە، جۆرێك دەقاودەقی و هاودەنگی نێوان خۆشەویستی و بەرگری دێتە کایەوە...**

**ئالان بادیۆ:** بێگومان! گۆدار بەردەوام لە فیلمەکانییدا لە ساتەوەختێك لە مێژووەوە بۆ ساتەوەختی دواتر، خاڵیی بەرگری و داهێنانەوەی لەبەرچاو دەگرت، بە دەربڕینێکی گشتیتر، هەموو ئەو شتانەی کە لە دیدی ئەو، چوون بەرەو بیناکردنی وێناکردن بوو، جێگیر دەکەن. من پێموایە ئەوەی بۆ ئەو پێویست بوو دابەشکردنی خۆشەویستییە لە نێوان تێگەیشتنێکی پتەو لە ئارەزووی سێکسی و گرژییەکی ئاشقانە کە پتر لە ژناندا دەدۆزرێتەوە؛ بە جۆرێك کە تەواوی پیاوان با کێشەنانەوە لەگەڵیان پێیان یان قبوڵکردنی دەسەڵاتیان لەسەر ئەم خاڵە ڕووبەڕوویان دەبنەوە. هەر زوو لە فیلمە تازەکەی گۆداردا لەگەڵی کارم کردووە. لەم فیلمەدا، پێدەچێ

ڕۆڵی فەیلەسوف-وتاربێژ لەسەر پانتایی کەشتییەکی دەریایی کاتبەسەربردن و دەوڵەمەندەکان یاری دەکەین، ڕەنگیشە یاری نەکەم، چونکە کەسێك چی دەزانێت کە ئەم هونەرمەندە لەگەڵ ئەو فیلمانەی بەرهەمهێناوە چ دەکات؟ من لە نزیکەوەی ستایشی وردبینییە کەسیی و ڕەوتە پڕزەحمەت و تاقەتپڕوهێنەکانی دەکەم و، ئەوە خۆشەویستییە کە تاڕادەیەك بەردەوام لەبەردەم هەرەشەدایە. ویڕای ئەوەش، ئەو مالیخولیایەی کە هەموو شتێکی گۆدار لەژێر کاریگەری خۆی دادەنێت، جیاوازی نێوان ئەو و من لە ڕووی پەیوەندی نێوان خۆشەویستی و بەرگری دەستنیشان دەکات. گومان دەکەم بەشێوەیەکی نەگۆڕدراو، لەو کاریگەرییە سوبێکتییە دوورم، تەنانەت ئەو کاتەی کە خۆشەویستی لەبەردەم هەرەشەدایە.

**پ: بەدیدی ئێوە پەیوەندی بەهێز لەگەڵ کەسایەتییە دیار و بەناوبانگەکان،ئەم یەزدانێتییە تازەی ئۆلۆمپیاتی تەلەفزیۆنی، تەنیا لە تەفرەدانی سیاسییەوە هەڵقوڵاوە یان گەواهییە لەسەر ڕەوت و ڕێبازێك بەرامبەر چیرۆکە خۆشەویستییەکان کە لە زانینی خەڵکەوە بۆ سۆزی خۆشەویستی سەرچاوە دەگرێت؟**

**ئالان بادیۆ:** دوو ڕێگا بۆ ڕاڤەکردنی ئەم دیاردەیە هەیە. لە گۆشەنیگای سیاسی، تاك بە خێرایی بەم ئەنجامە دەگات کە ئەم دیاردەیە شتێکی ساختە و خۆکردە. خەڵك بەم چەشنە چیرۆکەکان سەرگەرم دەکەن و بەم شێوەیە، هەستەکانیان لەوەی بەڕاستی گرینگە پەڕشو بڵاو دەکەن. لە ڕووی سیاسییەوە، چ بەرژەوەندییەك دەتوانێت لەم واقیعەتدا بێت کە کارلا دەبێتە بەدیلی سیسلیا؟ ئەوەش ڕوونە کە هەرگیز هیچ بەرژەوەندییەك لە ئارادانییە، بەڵام دەتوانیت هەوڵ بدەیت بۆ ئەوەی ڕاڤەیەکی جیاواز لە پروپاگەندەکانی دەوروبەری ئەم ڕووداوانە بەدەستەوە بدەیت؛ ئەوەش تەنیا ئەم پرسیارە لە خۆتان بپرسن: لەبەرچی ئەم پروپاگەندانە کاریگەربەخشن؟ بێگومان بەم هۆیەیە کە بەرامبەر بە چیرۆکە خۆشەویستییەکان پەیوەندییەکی گشتی هەیە. بەردەوام خۆشەویستی چینی دەوڵەمەندی کۆمەڵگا بەرامبەر بە کەسانی ئاسایی چینی زیان بەرکەوتوو بەشێوەی شانۆنامە دەرکەوتووە، بۆچی؟ دوو وەڵامی گونجاو بۆ ئەم پرسیارە هەیە: ئەشێ بەسادەیی ئەوە بخرێتە ڕوو کە ئەم بابەتە بە گشتێتی و گەردوونی خۆشەویستی پەیوەست دەبێت. ڕەنگە تەنانەت سارکۆزیش تووشی ئازار و خۆسەرکۆنە دەبێت کاتێك کە چاوەڕوانی

دەقێکە کە هەرگیز ئەو دەقە نایەت.. لە کاتێکدا پێوەرەکان بگۆریت و لە ڕاستییە سیاسییەکانەوە بەرەو ڕاستییەکانی خۆشەویستی برۆیت، دوژمنی سیاسیتان دواجار وەك تۆ دەبێت، ئەگەر چیش دەستباڵا نییە، دڵنیاییبەخشە. ئەو خۆشەویستییەی دەبێتە هۆی ئەوەی پادشایەك تا ئەو ڕادەیە ئازار بکێشێت، ئەو بە کۆیلەوە پەیوەست دەکات. لەو ئاستەدا، کۆیلەش حوکمی پادشای هەیە. ئەمەیە شێوەی ڕۆمانتیکی ژیان: خۆشەویستی بەردەوام لە هەوادایە، بەڵام ڕاڤەیەکی تریش هەیە: هاوبەشی ڕواڵەتی لە هەست و سۆزی خۆشەویستانە، هەروەها ئەوە نیشان ئەدات کە ئەم کەسانە، پادشا، سەرۆك کۆمار، سەرۆك و باوکی میللەت، ئەوەندەش تایبەت نیین. ئەشێ ئەوانەش بێ ئابڕوو بن. کەواتە هیچ بەڵگەیەکی بنەڕەتی بۆ ترسان لەوان یا ڕێزگرتنیان نییە. بۆ سیاسەت دەگەڕێمەوە، لانیکەم لە ئاستە سوبێکتی و سەرەتاییەکەی.

بەو چەشنەی کە پێشتر گوتم، لە پانتایی سیاسەتدا چەندان دوژمن هەیە. کەواتە ئەگەر ئەوان دوژمنی خۆشەویستیش بن، جێگای نیگەرانی نییە. ئەوان هەرگیز ئەم شانازییەیان دەستناکەوێ. هەر چەندەش هوشیاری سیاسییان هەبێت، دەبێ بڵێین هاوسەری سارکۆزی ئەوی فریودا یان نا،

پەیوەندی پێمانەوە نابێت، بەڵام دەبێ ئەمەش بڵێم کە ئێمە بە دەرکەوتنی خۆشەویستی لە ئاستی مەعریفیی بڵاوبوونەوەی چاکەکانی خۆشەویستی پەیوەستین؛ ئەو ئاستەی کە لە لایەن مەسیحیەت ئاراستە و پەخشیش بۆتەوە. ئەم دەرکەوتنە بەشێکە لە پانتاییەکی بێ سنوور و ڕادە کە تێیدا دلێری سیاسی لە داتا و زانیارییە پەتییەکان دروست دەبێت و بەردەوام لەم هەڵوێستەوە سەرچاوە دەگرێت کە دوژمنان هیچ بایەخێکی میتافیزیکی و هیچ چەشنە دەسەڵاتێکی باڵایان نییە. بەمەبەستی پێشگرتن لە گیرخواردنی مامناوەندییانەی سارکۆزیی، نموونەیەك لە خۆشەویستییەکی باڵا و پڕسۆز لە مێژووی فەرەنسا دەخەینە ڕوو: ئەو خۆشەویستییەی کە لە سەردەمی فرۆند (یان جەنگە ناوخۆییەکانی فەرەنسا)، شاژنی ئەوکاتی ئوستریا، لەگەڵ ئەو سیاستمەدارە ناسراو، گەندەڵ و گومڕایە، واتە مازارین، پەیوەندی بەست. لەدیدی شۆرشگێران، ئەم خۆشەویستییە بەربەستێکی سەخت و جددی و بەشەکی ژیانەکی بوو لە ڕەوانبێژی گشتی کە مازارین وەك بەرازی لە ڕێگالادەر دەردەکەوت. من ڕێگەیەکی باشتر بۆ گوتنی ئەوەی کە لە نێوان خۆشەویستی و سیاسەتدا تەنیا چەند پەیوەندییەکی ئاڵۆز هەیە، ناتوانم شتێکی ترم بە مێشکدا

بێت. جۆرێك جیابوونەوەی کەلێندار یان ڕێرەوێکی هەرەشەلێکراو ، کە تەنیا شانۆ دەتوانێ بەمانای ڕاستی وشەکە ڕوونی بکاتەوە. کۆمیدیا؟ تراژیدیا؟ هەردووکیان. خۆشەویستی، ململانێکردنە، لەودیو تەنیایی، لەگەڵ هەر شتێك لە جیهاندا کە ئەتوانێ بە هۆی بوونەوەی زیندوو بمێنێتەوە. ئەم جیهانە لە دیدی من سەرچاوەی خۆشحاڵی و شادمانییە؛ ئەو شادمانییەی کە بوون لەگەڵ ئەویتر بە دیاریی لەگەڵ خۆی دێنێت. لە جیهانێکی ئاوادا «خۆشمدەوێی» واتە: لەم دنیایەدا چاوێکم هەیە ئەویش تۆیی. لە ئاوی ئەم چاوە، تەواوی شادمانیی خۆم دەبینم و زاڵم بەسەر خودی شادمانییەکەت. بەو چەشنەی کە لە شیعرەکەی ملارمێیشدا دەیخوێنینەوە:

**ئەوە لە شەپۆلی ژیاندایە کە**
**بەشەیدایی ڕووتی خۆت دەگەیت.**

Alain Badiou

Translated By
Dana Shwany

# In Praise Of Love












لە بڵاوکراوەکانی
ماڵی وەفایی